خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ مێژووی کورد

﴿٢﴾

# ئایینی کورد



لە تۆفانی نوحەوە، تا سەرەتای ئیسلام

سالی (١٩٣٣) پێش زاین - (٦٢٢) زایینی، (١١) کۆچی



حسن محمود حمه کریم

١٩٩٧ زایینی - ١٤١٨ کۆچی

| | |
|---|---|
| ئادەم | ٢٥٨٩ |
| نوح | ٢٥٣٣ |
| توفانی نوح | ١٩٣٣ - ١٩٣٢ |
| ئیبراهیم | ١٦٤١ |
| موسی | ١٣٠١ |
| دروست بوونی دەوڵەتی ( ماد ) | ٨٣٥ |
| لەدایک بونی ( زەردەشت ) لە ( ورمێ ) : | ٧٢٠ |
| سەردەمی ( کشتاسپ ) فەرمان رەوای بەلخ و نوسینەوەی ئاوێستا | ٦٦٨ |
| مردنی زەردەشت | ٦٥٠ |
| روخانی دەوڵەتی ( ماد ) | ٥٥٠ |
| هێرشی( هیرۆسترا تۆش )ی یۆنانی وسوتاندنی کتێبخانە ویەرستگای( ئەرتیمید )ی شاری( ئیفس )لەکوردستان | ٣٥٦ |
| هێرشی( ئەسکەندەری مەکدۆنی )وسوتاندنی( ئاوێستا )ودەستنوسەکانی کتێبخانەی( دیار بکر )لەکوردستان | ٣٣٢ پێش زاینی |
| لە دایک بونی حەزرەتی ( عیسا ) و، سەردانی وەفدی کوردی ( ورمێ ) بۆ شاری ( بیت اللحم ) | ( ١ ) زاینی |
| نووسینەوەی دووبارەی ( ئاوێستا ) لەلایەن پاشای فارس ( ئەردەشێری یەکەم ) | ١٦٨ دوای زاین |
| پیرشالیاری زەردەشتی ( یەکەم ) | ٤٦١ |
| لە دایک بونی ( محمد ) پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێت | ٥٧١ |
| دابەزینی وەحی بۆ سەر ( محمد ) | ٦١١ |
| دەست پێ کردنی قۆناغی نهێنی بانگەواز و، هاتنی وەفدی کورد( کابانی کوردی ) بۆ لای ( محمد ) لەشاری مەککە | قۆناغی ( مەککە ) بانگەواز ( ١٣ ) ساڵ |
| کۆچ کردنی پێغەمبەر لە ( مەککە ) وە بۆ ( مدینە ) | ( ٦٢٢ ) ی زاین، ( ١ ) ی کۆچی |
| وەفاتی ( محمد ) | ٦٣٢ زاینی ( ١١ ) کۆچی |
| راپەرینی ئیسلامی خەڵکی شارەزوور، ناردنی لەشکری فارس بۆ سەرکوت کردنیان | ٦٣٦ زاینی |
| گرتنی ( مدائن ) پایتەختی فارس | ٦٣٧زاینی( ١٦ )کۆچی |
| رزگار کردنی کوردستان لە ژێر دەستی فارس | ٦٣٩زاینی ١٨کۆچی |
| پیرشالیاری ( دووەم ) ( مصطفی خوا داد ) | ٦٤٠ ز -١٩ ک |

خشتە وهێلکاری   مێژووی ئاینی کورد پێش ئیسلام و   حسن محمود حمه کریم

(سەخاوی) دەڵێ :( مێژوو ، هونەری گەڕانە بەشوێن ڕوداوەکانی زەمانەدا )[1]

(مەسعودی) دەڵێ :(مێژوو ، زانستێکە لە دەنگ و باسان)[2]

(طبری) دەڵێ :( مێژوو ، هونەرێکە لە ڕوداوەکانی زەمانە دەکۆڵێتەوە )[3]

* * *

لە قورئاندا لە چەندین جێ دا دەست نیشانی ئەوە کراوە، کە بۆ هەموو گەلێکی سەرزەوی پێغەمبەرێک یان زیاتر نێرراوەو بەزمانی ئەو میللەتە نامەی تایبەتیان بۆ دابەزیوە، هەتا لێی تێ بگەن ..

وەک دەفەرموێ :

"ولقد بعثنا في كل امة رسولا" ٣٦ (النحل)

(( ان من امة الا خلا فيها نذير ))

(( وما ارسلنا من رسول الا بلسان قومه ليبين لهم ))

(( منهم من قصصنا عليك ، ومنهم من لم نقصص عليك ))

## به ناوی خوای بەخشندە

### پێشەکی:

ئاینی کورد پێش ئیسلام.. لەقورس ترین و گرانترین بەشەکانی
مێژووی کوردە.. نووسینەوەی ئەم چمکە.. ماندوبون و بەدواد
گەڕانی زۆری دەوێت..

ئەگەر ئەم لایەنە بخرێتە سەر ڕاستە، ئەوا زنجیرەی پێکهاتە
هەمەلایەنەی کۆمەڵگەی کۆنی کوردیمان دەدۆزینەوە، بار
کۆمەلایەتی و دەرونی و ڕۆشنبیری و زانستیمان دەناسین.. ئەگە
سەرکەتو بوین، ئەوا دەردەکەوێت کە بۆچی کوردپێش هەمو
گەلانی تر، نوێنەری (وەفد) دەنێرێتە مەککەو لەقۆناغی نهێنی د
بە ئیسلام ئاشنا دەبێت..

لەم بەشەدا هەوڵ دراوە،هەموو سەدەو سەردەم و ساڵەکا
بەگوێرەی دوورو نزیکی ڕوداوەکان.. هەر لە (نوح) ەوە، هەت
(محمد) - سەلامی خوایان لێبێ - نزیک بکرێتەوەو، بەهێلێک
زەمەنی بکێشرێت..

لەم هەوڵەدا چەندیم پێکابێ، سوپاسی خوای لەسەر دەکەم
هیوادارم ببێتە پێشەکیەک بۆ داهاتوو.. وەئەگەر هەڵەیەکیش
یان نەپێکرانێک ڕوی دابێت - هەموو مرۆڤین - داواکار
بەرەخنەی زانستی ڕاست بکرێتەوە، کە یاریدەی باسەکە بدات
کە ئەویش هەر جێی سوپاس و پێزانینە..

## کوردستان لانکی دوەمی مرۆڤایەتیە :

کە ( ئادەم و حەوا ) لە ئاسمانەوە دابەزێنرانە سەر زەوی، بەگوێرەی قسەو ڕای مێژوو نووس و لێکۆڵەرەوان، ئێوارەی ڕۆژێکی هەینی لە سەر شاخێک لە شاخەکانی وڵاتی هندستان بە ناوی ( ڕاهۆن ) دابەزین .[4]

بەڵام (ابن عباس) دەڵێ لە سەر شاخی ( بوذ) لە هندستان دابەزین.[5]

(ابن کثیر) دەڵێ زوربەی (ڕا) لەسەر ئەوەیە کە (ئادەم) نێژرا لای ئەو شاخەی کە تیا دابەزی لە هندستان.[6]

ئەمڕۆ لەسەر زەوی نزیکەی پەنجا گۆڕ بۆ ئادەم هەیەو گۆڕی وا هەیە (دە) مەتر درێژە هەر یەکە دەیەوێ بیکاتە بەشی خۆی، کەواتە هندستان لانکی یەکەمی مرۆڤایەتیە، پاشان مەردوم بڵاوبونەوە.. دوای (ئادەم) چەندین پێغەمبەری تر هاتن.. هەتا سەرە گەیشتە حەزرەتی (نوح) - سەلامی خوایان لێ بێت- خەڵکی زۆر بوو بوو، هەر هەمووی لە بت پەرستیەکی خەستا دەژیان.. بەگوێرەی لێکۆڵەرە نوێ کەی ( محمد قاسم محمد ).[7]

ماوە لە نێوان ئادەم و نوح دا ( ٢٢٥٦ ) ساڵ دوور بووە.. نوح لە قارەی هندستان زۆر دوور نەکەوتبووەوە ( ٦٠٠ ) ساڵ ژیانی لەو ناوچانەدا بە بانگی خەڵکیەوە بەخت کرد، بۆ لای خوای تاک و تەنهاو، وازهێنان لە دارو بەرد پەرستن.. بەڵام چونکە خەڵکی سەرەتا بون، ئەو زەینەیان بۆ دروست نەبووبوو لە نوح تێ بگەن.. نوح زۆر ماندو بو، تەنانەت نائومێد بو.. داوای لە خوا کرد لە ناویان بەرێت.. خوای گەورەش بە هانایەوە هات و داواکاریەکەی جێبەجێ کرد، داوای لێ کرد کە کەشتیەک دروست بکات، هەموو بڕوادارەکان- کە زۆر کەم بوون- لەگەڵ هەموو جوتێک/نێرو مێ یەک سوار بکات.. هەمو شت جێبەجێ بوو، لە ئاسمانەوە ئاو بە لێزمە دەهاتە خوارەوە، لە زەویەوە کانیاوە نوێو کۆنەکان تەقین و ڕوبارو دەریاکان هەڵچوون. چەم و شیوو دەشتەکان پڕ بوون لە ئاو، بێ بڕواکان بەرەو کێوە بەرزەکان ڕایان کردو، هێرشی ئاو لوتکەکانیشی داپۆشی، جگە ئەوانەی ناو کەشتیەکە، گیاندارێک لەسەر زەوی نەما- مەگەر یەکێک خوا خۆی پاراستبێتێ - دکتور عبدالوهاب نجار دەڵێ : (تۆفانەکە هەموو زەوی گرتەوە ).[8]

زانایانی جیۆلۆجی دەڵێن.(لەو ڕوداوەمان کۆڵیەوە، بینیمان تەنانەت لە کێوە بەرزەکانیش دا، پاشماوەی گیانداری وەها هەیە، کە لە ئاودا نەبێ ناژی.. ئەوە تۆفانەکە هێناویەتی.. ).. ابن کثیر دەڵێ (تۆفانەکە هەموو سەر زەوی گرتەوەو بێ باوەڕ نەما.. ).[9]

هەموو بێ بڕواکان بە کورەکەی نوحەوە لەناو چوون..!! ئەو کەشتیە گەورەیە، بەسەر ئەو لێزمەو تۆفانەوە لەنگەری گرتبوو.. بەسەر شەپۆل و گەردەلوولی ئەو دەریا بێ وشکانیەوە دەڕۆشت.. کەش و هەوا بەرەو هێمنی دەچوو.. ئاسمان ئاوەکەی خۆی دەبردەوە..

زەویش ئەوەی خۆی هەڵدەلووشێ "کەشتیەکە نزم دەبویەوە" نوح و بڕادەرەکان نەیان دەزانی لەکوێ دەنیشنەوە، هەر بۆیە نوح داوایەکی تری لەخوا کرد (ربي انزلني منزلاً مباركاً وانت خير المنزلين)، (خوایەگیان لە جێیەکی پیرۆزدا دامان بەزێنە. لای ڕەحمی خۆت چاک ترین جێیە) دوعاکەی گیرا بوو.. لەسەر چیای (جودی) ڕاوەستا.. (واستوت على الجودي) خوای گەورەش لەسەر خاکی ئەمڕۆی کوردستانی پیرۆز دای بەزاندن..

(دکتور عبدالوهاب نجار) دەڵێ "شاخی جودی" لە ناوچەی(دیاربەکر)ە کەناوچەیەکە لەچیاکانی (ئورمیە)..[10]

(فیروز ئابادی) لە (قاموس المحيط) دا دەڵێ (شاخی جودی لە (جزیرە)یەو، لە تەوراتدا ناوی بە (ئارارات) هاتوە..

(محمد قاسم محمد) دەڵێ (کەشتیەکە لەسەر چیای ئارارات گیرسایەوە).[11]

(مسعودی) دەڵێ(جودی شاخێکە لە وڵاتی باسوری لە جزیرەی ئیبنی عومەر لە وڵاتی موسڵ کەلەنێوان ئەو شاخەو ئاوی دجلەدا هەشت فەرسەخ هەیە..)[12]

کەواتە هەموو لێکۆڵەرەوان لەسەر ئەوە ڕێکن کە نیشتنەوەی کەشتیەکە کوردستانە.. ئەگەر هیندستان لانکی یەکەی مرۆڤایەتی بووبێ، ئەوا کوردستان لانکی دووەمی مرۆڤایەتیە.. ئەم مەردمەی کە ئەمڕۆ لەسەر زەوی دەژین، ئەم میللەت و گەل و خێڵ و وڵاتانەی، بەڕەنگ و زمان و ناوی جیاواز، لەسەر زەوی بڵاون.. هەر هەموویان کوڕەزازای کوردن.. لە خاکی کوردانەوە بڵاوەیان کردوە.. ئەم هەموو گەل و وڵاتانەی ئەمڕۆ ناویان هەیە.. لەبنچینەدا دەبنەوە بەنەتەوەی کورد.. ئەوە بەدوور کەوتنەوەیان هەریەکە ناوێکیان بۆ خۆیان و خاکەکەیان هەڵبژاردوە، زمانێکی تریان بو خۆیان دروست کردوە، کەواتە کورد باوکی مرۆڤایەتیە.. لێرەدا ئەوەمان بۆ دەبێتە پرسیار کەئایا نوح کوردە، یان کورد لەنەتەوەی نوحە..؟ ئەمە ڕاستیەکەو بەپێی زانیاریەکانی سەرەوە پێویست بەدوو دڵی ناکات..!!

(ئەمین زەکی) دەڵێت (بەگوێرەی ڕیوایەتی بابلیەکان، سەفینەی نوح سەلامی لێ بێت، لەدوای تۆفان لەسەر شاخی(نیسیر) نیشتوەتەوە.. (ئاشور ناصر پال)ی قراڵی ئاسوری دەڵێ ئەم شاخە لە ڕۆژهەلاتی ئاسورە، شاخێکی تەنیا و سەرەکەی وەکو ڕم تیژە، ئەم گێڕانەوەیە، وتەکەی(مینۆ ڕسکی) دەسەلمێنێ، نوسەرە ڕۆحانیە گاورەکان دەڵێن سەفینەی نوح لەسەر شاخی (جودی) نیشتوەتەوە، ئەم وشەی (جودی)یە لە بنچینەدا هەر لە وشەی (گوتی)یەوە هاتوە، کەشاخی (نیسیر) یشی پێ دەڵێن، ئەم شاخ و ناوچەیە دووەم جێگەی پەیدا بوون و زۆربون و بڵاوبونەوەی مرۆڤە..(هارووەی زوینسن) و (هەنری براستد) دەڵێن( کە) خەڵکی کوردستان زۆر بوون، بەشێکی ڕووی کردۆتە باشوری ڕۆژئاوا بۆ (سوریە و فەلەستین و ئەفریقا) و بەشێکی تریش ڕوی کردوەتە پشت شاخی قفقاس و شوێنانی تر..)[13]

(ئیمامی ئەحمەد)[14] دەفەرموێ : پێغەمبەر درودی خوای لەسەر بێ دەفەرموێ (سام ابو العرب وحام ابو الحبش و یافث ابو الروم) یان لەجێ یەکی تردا دەفەرموێ (ولد نوح ثلاثة، سام یافث وحام، وولد كل واحد من هذه الثلاثة ثلاثة، فولد سام العرب و فارس و روم، وولد یافث الترك و السقالیة و یأجوج و مأجوج، وولد حام القبط و السودان و البربر..)[15]

واتە نوح سێ کوڕی بوو بەناوی (سام و یافث و حام) وە هەریەکە لەو سیانە سیانیان لێ کەوتەوە، لە (سام عەرەب و فارس و ڕۆم بوو، لە (یافث) تورك و سقالیە و یەئجوج و مەئجوج بوو، لە (حام) قبطي و سوداني و بەربەر کەوتەوە.. ئاخۆ ئەم کوڕانە پێش لافاوەکە لەدایك بوبن و لە کەشتیەکەدا لەگەڵیدا بون، یان لە خاکی کوردستان لەدایك بون و، پاشان بەزەویدا بڵاو بونەوە.. (ابن کثیر) و (عبدالوهاب نجار) دەڵێن ئەم سێ کوڕە لەکەشتیەکەدا لەگەڵیدا بوون،.. هەر چۆنێك بێت، ئەوانە هەرهەمویان لە خاکی کوردستان گەورە بوون.. بەئاو و هەوای کوردستان گۆش بوون و لەو مەڵبەندەوە بڵاوەیان کردوە، بۆیە دەتوانین بڵێین (کورد) باوکی مرۆڤایەتی‌یە. (برعوشا) کەنووسەرێکی بابلی‌یە، لەسەدەی سێ‌یەمی پێش زایندا گوتویەتی (کەشتیەکەی نوح لە شاخی (کوردویین) نیشتوەتەوە..)[16]

(هەتائێستەش لە کوردستاندا هەندی گوند بەدەوروبەری ئەو چیایەوەیە(جودی)، ئەگەر بێت و لە ناوەکانیان بکۆڵینەوە، دەبینین ووشە ڕەسەنەکەی لە ناوی (نوح)ەوە پێك هاتووە.. بەڵام ئەوەندە هەیە پێشگرێك یان پاشگرێکی بۆ زیاد کراوە، وەکو (نوخ، ئاخ نوخ، نوح) بۆ نمونە ووشەی (شارنوخ) لە (شار+نوخ) پێك هاتووە، واتە شاری نوح، هەروەها ووتەی(زاخۆ) ش لە(ژێر +نوح) پێك هاتووە، واتە ئەو شوێنەی وادەکەوێتە خواروی وڵاتی نوحەوە، واش باوە گوایە دوای لافاوەکە، کەشتیەکە بەسەر چیای جودیەوە نیشتوەتەوە و چل پیاو و ئافرەتی لێ هاتوەتە دەرێ، هەر لەدامێنی ئەو شاخەش دا گوندێکیان بۆ خۆیان دروست کردوە، هەتا ئێستاش ئەو گوندە هەر ماوە، ناویشی (هەشتایانە) چونکە هەشتا کەس ئاوەدانیان کردۆتەوە..)[17]

(ئەو نووسراوە دێرینانە سەرجەمیان بە ئاشکرا ئاماژەیان بۆ ئەوە کردوە کەوا کەشتیەکەی نوح بەسەر شاخێکەوە لەنگەری گرتوە دەکەوێتە کوردستانەوە).[18]

نوح لەکەش و هەوایەکی نوێ، لەخاك و ئاوێکی نوێ، قۆناغێکی نوێی دوور لەبت پەرستی دەست پێ کرد، هەر هەموو خەڵکی کڕنووشیان بۆ یەك خوا دەبرد.. ماوەیەکی زۆر لایان نەدا، چونکە ئەو کارەساتە گەورەیان بینیبویان بیستبوو، نەیان دەوێرا لابدەن، ئەمە چەند سەدەی خایاندوە، زمان و خاکی کوردان بویە مەڵبەندی یەکتا پەرستی، مرۆڤ بە ئاینی پاکەوە، لە کوردستانەوە، بەهەموو زەویدا بڵاوەیان کرد، (بەڵگەو نیشانە زۆر و زەبەندەیە کەخەڵکی ئەم وڵاتی کوردەواریە پێناسە و زمان و خاك و جێ و ڕێی خۆیان ون نەکردوە و خوێنی خۆیان بۆ سەربەستی و پاراستنی وڵاتیان بەخشیوە).[19] (گوتی‌یەکان گەلێکی کۆنی شاخ نشین و چیاین، لەچیاکانی زاگرۆس

پەیدا بوون، ئەوچیایانە بە نیشتمانی کۆن و دێرینی ئەوان لە قەڵەم دراوە، مێژووی دەوڵەتی ئەم گەلەش لەدەوروبەری سەدەی بیست و چواری پێش زاینـدا دەستی پێ کـردوە ).[20]
بەم سەرچاوەدا دیارە، کورد پێش لەچوار هەزار و پێنج سەد ساڵ لەمەوبەر حکومەت و شارستانیان بووەو ڕۆشنبیری ئەو زانستانەیان زانیوە، لەتەورات( سفر التكوين ٩/٢٨-٩) (نوح ٣٥٠ساڵ دوای تۆفان ژیا). بەم جۆرە نوح سەلامی خوای لێ بێت (٦٠٠) ساڵ لەناوچەی هیندستان ژیاوەو دوای تۆفانەکەش (٣٥٠) ساڵ لە کوردستان ژیاوە، (مەسعودی) دەڵێ (نوح (٣٥٠) ساڵ لە کوردستان ژیا )[22].
ئەمە ئەو بیردۆزەش پوچەڵ دەکاتەوە کە زۆر لە مێژوونوسان و لێکۆڵەرەوان هێناویانە کەگوایە چەند هەزار ساڵێک پێش زاین بەهۆی کارەساتێکەوە میللەتانی ناوەڕاست و باکور و ڕۆژهەلاتی ئاسیا، وولاتی خۆیان جێ هێشتوەو بەرەو شاخەکانی زاگرۆس و تۆرۆس و کوردستان کۆچیان کردوە، بەڵکو ڕاستیەکەی هەر ئەوەیە کە کوردستان بەبێ کۆچ بۆ کردن خۆی لانکی دوەمی مرۆڤایەتی‌یەو، بەڵکو لە کوردستانەوە وەکو (هنری براستد) باس دەکات بە جیهاندا بلاوبونەتەوەو هەر ئەوەش ڕاستیەکەیە کەباسمان کرد..!!
(هـ. ا. رایت) دەڵێ (١١) هەزار ساڵ لەمەوبەر کوردستان - لەڕوی جیۆلۆجیەوە - گۆڕانێکی باشی بەخۆوە بینیوە، (٩) هەزار ساڵ لەمەوبەر سەرما و سۆڵەو سەهۆلبەندان لەچیاکانی زاگرۆس (واتە شاخەکانی کوردستان) کۆتایی هاتوەو (واتە دوای لافاوەکە) هەتا ئەمڕۆ ئاو وهەوا ئاسایی بووە، ئیتر خەڵکی کوردستان دەستیان داوەتە کشتوکاڵ و دێهات و گوندیان لەناوچە کشتوکاڵیەکاندا دامەزراندوە )[23] (ئەلیکساندر ئەلفریدۆ ڤیچ) دەڵێ (ئەشکەوتە بەناوبانگەکەی شانەدەری(ناوچەی شارەزوور) لەشاخەکانی کوردستان، وەک ئەرشیفێکی نایابی پاراستنی شوێنەواری شارستانی و مێژووی مرۆڤایەتی‌یە بە درێژایی( سەد ) هەزار ساڵ )[24].
ئەم زانایە مێژووی ژیان لەکوردستاندا دەباتەوە بۆ ئەو مێژووە دوورە، ڕەنگە ئەو ئاسەوارانەی ناو ئەشکەوتی( شانەدەری ) پاشماوەی پێش تۆفانەکە بێت..کەئەمەش ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ کە پێش تۆفانەکەش ژیان و شارستانی لە کوردستاندا بووە..!!
لەکتێبی (ئاوێستا ) دا هاتووە لەبەشی (ڤاندیدات)دا کە (خواداوا لە زەردەشت دەکات کە ئەشکەوتێک (ڤار) دروست بکات، جوانترین نێر ومێ لەگەڵ خۆی ببات لەڕوەک و ئاژەڵ و مرۆڤ، هەتا ناشرین و خواروخێچ و درۆزن بە زۆق و سەهۆڵ تیابچن..)[25]
مەبەست لە خواروخێچی، نالەباری و ناشرینی بیروباوەڕە، کەدەبێ تیا بچن زۆر کەس قەڵەمیان باداوەو بیریان جەڕاندوە بۆ ئەوەی نهێنیەکانی مێژوو بدۆزنەوەو یەکێک لەوانە( محمد قاسم محمد )ە کەلەکتێبێکی (٥٠٠) لاپەڕەیی دا لە (قەتەر) بەم دوایە بلاوبویەوە زۆر هەوڵی داوە و دەڵێ (١٦٥٦) ساڵ لە نێوانی ئادەم و تۆفاندا هەیە.. بەلام (٢٩٢) ساڵ لەنێوان تۆفان و لەدایک بوونی حەزرەتی

ئیبراهیم دا هەیە، واتە لە ئادەمەوە هەتا ئیبراهیم ( ٢٥٤٨ ) ساڵە، وە ئیبراهیم ( ١٦٤١ ) ساڵ پێش حەزرەتی عیسا لەدایک بوە..سەلات و سەلامی خوایان لیٚ بێت، وە ( ١٣٠١ ) ساڵ پێش زاین ( موسی ) لەدایک بوو.. )[26]

هەندیٚ لە مێژوو نووسەکان دەڵێن کورد و شاری پێغەمبەرێکی زۆریان هەبوە و نازناوی هەموویان (زەردەشت ) بوە، وەیەکەم زەردەشت بە ( نوح ) ناودەبەن.. وە ئیبراهیم زەردەشتی دووەمەو بەم جۆرە دەڕوات هەتا دوا زەردەشت کە ساڵی( ٦٦٠ ) پ.ز پەیدا بوە لە( ورمێ ).. مەردۆخی دەڵێ( هەندێک دەڵێن، سەرەتای پەیدا بونی یەکەم زەردەشت دەگەڕێتەوە بۆ سیٚ هەزار ساڵ پێش زاین، کە ( نوح ) پێغەمبەر لەسەردەمی ئەمدا لەدونیا دەرچوو.. ( مەبەست لەم زەردەشتە هەر ( ئیبراهیم )ە..

مەردۆخی لەجیٚیەکی تردا دەڵیٚ ( ئورذ و کسۆس و ئە رسطو ) دوو زانای یونانی پێش زاین( سەردەمی زەردەشت دەبەنەوە بۆ شەش هەزار ساڵ پێش ئە فلاطون، واتە ( ٨٣٦٥ )ساڵ پێش ئەوڕۆ..[27]

هەندێکی تر ئەو ( فریدون )ەی کەکاوەی ئاسنگەر، زوحاکی بۆ لەناو برد، هێنایە سەر تەختی پاشایی، ئەو ( فریدونە )بە زەردەشتی دووەم دادەنێن، هەروەها کاوە فریدون دەشارێتەوە لەشاخی( دەماوەند ) و پاشانیش دەیهێنێتەوە، بەم بۆچونەدا دیارە کە (کاوەی ئاسنگەر) ڕاپەڕینەکەی شۆڕشێکی ئاینی بووە و بەرپای کردوە لە دژی بت پەرستان و چەسپاندنی ئاینی خوا.. بەڵام خاوەنیٚ کتێبی ( اثبات الوصیة )[28]

کەهەندیٚ بە ( مەسعودی ) دەزانن و( ابو کلام ئازاد ).[29]

لە کتێبی ( زەردەشت ) دا دەڵێن ( فریدون ) ذي القرنين بوە، کەلەخاکی کوردستانەوە هەڵساوەو ئاینی خوای بە هەموو ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای گۆی زەویدا گەیاندوە.. لە کتێبی ( دبستان المذاهب ) لاپەڕەی( ٥ )دا هاتوە کەپێش پاشای کورد( کشتاسپ ) بە چەند هەزار ساڵ، پێغەمبەرێکی تر هاتوە بە ناوی( ماناباد ) کە لەشاری مهاباتی ئەمڕۆ ژیاوەو نامەی تایبەتی خۆی بوە.. بەمانەدا دیارە کە کورد بەردەوام خەریکی خوا پەرستیەکی پاک بووە، بەردەوام پێغەمبەریان تیا هەڵکەوتوە مێژوو نووسانی وەکو ( احسان نوری ) و ( فردەوسی ) و ( ابن الاثیر ) دەڵێن ابراهیم و زەردەشت هەریەکێکن..لەدەست دوژمنانی ئاینی ڕایان کردوە هەتا گەیشتونەتە(کنعان ) ..لە( المنجد في الادب والعلوم ) لەلاپەڕەی ( ٤ ) هەمان ڕای هەیەو دەڵیٚ ئەو زەردەشتە لە( ٢١٠٠ ) ساڵ پێش زاین ژیاوە.. وەلە( اطلاعات عمومی ) دا دەڵیٚ ئیبراهیم( ٢٩٢ ) ساڵ پاش تۆفانە کە هاتوە.. وەدەڵیٚ تۆفانی نوح لە دەوروبەری دەریای خەزەر بوە لەساڵی ٢٢٠٠-٣٤٠٠ پێش زاین لە سەر کێوی( جودی ) نیشتۆتەوە کەبەشێکە لەزنجیرە چیای ئارارات ..لەپەڕاوی( رفع الخفا ) دا دەڵیٚ شاری (نەهاوەند ) واتە( نوح ئاوەند ) کەبەمانای( نوح ئاوا ) دێت و نوح بنیاتی ناوە لە نزیک( هەمەدان ) ی ئێستەوەیە..بەڵام لە( حاشیەی محی الدین العربی ) لە تفسیری ( خازن ) دا دەڵیٚ ئیبراهیم خەڵکی( کۆیە )ی عیراقە و هەتا ئێستەش پاشماوەی( نەمرود ) لە

نزیک ڕانیه ماوه که ئاگرەکەیان بۆ ئیبراهیم کردەوە،(نەمرود) ناوی (نەمارد کوڕی کوش کوڕی حا
کوڕی نوحه).[30]
لە(کشف الغمة)دادەڵێ ئەوەی بەمەنجەنیق ئیبراهیم ی هەڵدایە ناو ئاگرکە یەکێکی دەست ڕاست بو
..لە تەفسیری(بیضاوی) سورەی (الانبیاء) باسی ئیبراهیم و کورد دەکا
.. ناوی ئیبراهیم دەبەنەوەسەر(ئەورام) بەمانای(هەورام) کە وشەی (هەورامیە) .[31]
(براستد) دەڵێ (نەتەوەی ئاری لەسەرەتای پەیدابونیەوە ئاینێکی پایە بڵند و بەرزیان بوە، ڕێزیان لە
ئاگر گرتوە، وەک هەموو ئاینە خوایی‌یەکانی تری کۆن، ڕوناکی و ئاگریان بە شتێکی بەنرخ و بەسو
داناوە، چونکە خوا ڕوناکی کردوە بەسەرەتایی بوون، ژیان بەبێ ڕوناکی خوا نابێت، کەواتە نەتەوەی
ئاری هەر لەسەرەتاوە خواپەرست بوون، خوا بۆ هەر نەتەوەیەک پێغەمبەرێکی ناردوە هەتا ڕابەریا
بکات بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانی خۆی، نیشان دانی ڕێگای ڕاستی ژیان..)[32]
باوکی مێژوو (هێرۆدۆتس) کە چوار سەدساڵ پێش زاین ژیاوە دەڵێ (لە ئێران(ئاری) پەرستگای بت
پەرستان نەبوە)[33] واتە پێش سە دە ی سێ‌یەم و دوەمی پێش زایندا وتویانە، هەزاران ساڵ تێپە
بوە بەسەر ئەو قسەیەدا کەوا دەگەیەنێ نەتەوەی ئاری زۆر لەکۆنەوە فێری ئەوە بوون کە خوا بەتاک
تەنها بناسن، بەڵکو لەسەرەتای پەیدا بونیانەوە خوایان ناسیوە و ئەوەیان زانیوە کە خوا تاک و تەنه
و بێ هاوبەشە و سەرچاوەی هەموو بونێکە)[34] مەردۆخ دەڵێ (کورد لە کۆندا هەمیشە ئاگر
ڕوناکیان خۆشویستوە و دڵیان پێی کراوەتەوە و لە تاریکایی پەست و دڵ تەنگ بوون)[35] دکتور هنر
براستد دەڵێ (بڕوایەکانی نەتەوە و ڕەچەڵەکی ئاری ئەوە نیشان دەدات،کەوا ئاینێکی پایە بڵند
گەورەیان هەبوە، ئاگر کردنەوە - بۆ پەرستن نەبوە - بەڵکو بۆ ئەوە بوە کە ئاگردانەکانیان هەمیشە
داگیرساو بێت و ڕوناکی بدەن و تاریکی و گومڕایی لەناو بەرن..) مسعودی دەڵێ(زاناکانیان نا
نابوو(موگوش) (مو) واتە (ئاین) (گوش) واتە پیاوا مانای (پیاوانی ئانی) دەدات. لە عەرەبید
(موگوش) بوەتە (مەجوس). لە جێ‌یەکی‌تردا دەڵێ (موبەزان) واتە پارێزرانی ئاینی..ئەمان
پایەیەکی سیاسی ئاینیشیان بوە، لای کۆمەڵگا زۆر بەڕێز و پایەدار بوون، هاوبەشی کۆبونەو
بەرزەکانی چونەسەر تەختی پاشایان دەکرد)[36]
تەنانەت جەژنە نەوروزەکەش هەر جەژنی ئاینی وباوەڕبوە، زیاتر لەوەی کە پەیوندی بەزوحاکەو
هەبێت، بەلام چی یە مێژوی کونی کورد،بەتایبەتی پێش(دەوڵەتی ماد) ئاڵۆزو و(ونە)،مێژوو بەروار
ڕوداوەکان شێواون، یان پاش وپێش کەوتون.. نەوروز پێش زوحاک و کاوە بوە، پاشان ڕوداوی کاو
ڕێکەوتی نەوروز دەکاو، دەبێتە (دوو جەژنە) و بە یەکەوە دەبەسترێت، دەڵێن (نەوروز جەژنی دروست
بونی ئادەم و بونەوەرە..) یان (جەژنی ئەو ڕۆژەیە، کە خوا ڕوناکی خولقاندوە) ڕاپەڕینی کاوە، لە
دژی زوحاکی بت پەرست زۆردار، کە کوردی بڕواداری کردبوە بەندە، جەنگی نێوان بڕواو بێ بڕوا بو
زیاتر لەوەی شتێکی تر بێت.. (جەمشید) یەکێکە لە پاشا بڕوادارە ناودارەکانی

کورد..[37] (فیردەوسی) دەڵێ (لە سەردەمی جەمشیدا واز لە بت پەرستی هێنراو ئاینێکی نوێی خواپەرستی بڵاوکرایەوەو ئەم گۆڕانکاریە کرایە جەژنی نەورۆز..) پاشان دەڵێ (لە سەردەمی جەمشیدا وەرچەرخانێکی گرنگ لە شارستانی و پێشکەوتن پەیدا بوو، تەختێکی لە جەواهیر دروست کرد، دەچوە ناوی (دێو) بۆیان هەڵدەگرت و بەئاسماندا دەیانگێڕا، ئەم چەرخە زێڕینە کرایە جەژنی نەورۆز..) دێوی بۆ هێنرایە ژێر دەسەلات، هەروەک چۆن بۆ سلیمان وداود پێغەمبەر سەلامی خوایان لێ بێ - کرابوو.. لە جێیە تردا دەڵێ: ئەم پاشا کوردە (جەمشید) ڕۆژێک شوشە بەندێکی دروست کرد لە تەشت یان چەرخ و فەلەک، دەچوە ناوی (دێوو درنج) چنگ لەسەر شان هەڵیان دەگرت و بە ڕۆژە ڕێیەک بە ئاسماندا لە کێوی (دەماوەند) ەوە دەیان گەیاندە شاری (بابل)..[38]

پێش جەمشید نەورۆز هەربوە، بەڵام ئەم کردیە سەریساڵی نوێ (هەتاوی)، جەمشید لە بنەماڵەی پێشدادیە کە یەکەمین بنەماڵەی پاشای (ماد) بوون.. جەمشید ناوی لە ئاوێستادا هاتوە..

(جەمشید) یەکەم کەس بووکە شارستانی هێنایە سەرزەوی، پەرەی بە ژیانی ئابوری و کۆمەلایەتی دا، ئاسنی نەرم کرد کەرەسەی جەنگی لێ دروست کرد، کەشتی دەریایی دروست کرد، خەڵکی فێری خۆشتن و درومان و جل و بەرگ دروست کردن لە کەتان و ئاوریشم کرد، فەرمانی دا بە دێوەکان کە بۆ یەکەم جار لە خشت و گەچ و بەرد، حەمام و خانوو کۆشک و تەلار دروست بکەن زانیاری پزیشکی داهێنا..[39] (کامل بصیر) دەڵێ تەمەنی نەورۆز لە بیست و پێنج سەدە پێش زاینی زیاترە..[40]

وەک پێشتر ووتم (نەورۆز) لە کاوەو زوحاک کۆنترە، تەنها ئەوەندە هەیە ڕوداوی شۆڕشی کاوە، نزیک بە سەری ساڵ بوەو پێکەوەیان گرێ داوە، ئەو دوو جەژنەیان کردوە بە یەک، من وای دەبینم نەورۆز هی هەموو گەلە ئاریەکان بێ -هی سەردەمی (نوح)-، کوردیش تیایدا بەشدارە، بەڵام کاوە تایبەتە بە کورد..

(ئیبراهیم) پێغەمبەر لە کوردستاندا لە دایک بوە، لەدێی (بەرزە) لە شاخی (قاسیون) ەوە لە ناوچەی جزیرە خەڵکەکەی خەریکی ئەستێرە پەرستن و بت پەرستی بوون، هەرچی لەسەر زەوی بوە، بێ بڕوا بوە جگە لە ابراهیم و ژنەکەی و لوطی برازای )[41] من وای بۆ دەچم کە (نەورۆز) لەسەردەمی حەزرەتی ابراهیم کۆنتر بێ وەک قورئان دەیگێڕێتەوە و، مێژوونوسەکانیش پشت گیری لێ دەکەن، ئەو کاتەی کە ئیبراهیم ویستی بتەکان بشکێنێ، ڕۆژی نەورۆزی هەڵبژارد. چونکە لەو ڕۆژەدا شار چۆڵ دەبێ و، پاشاو گەداو منداڵ و گەورە، دەچنە دەرەوەی شار، لەو دەشت و دەروو سەوزاییەدا، سەیران دەکەن، هەتا ئێوارە بۆ خۆشی دەمێننەوە، کە ئەویش سەرەتای بەهارو جەژنی نەورۆز بوو،تەنانەت (نەمرود) ی پاشاو زێوانی پەرستگاو بتخانەکان شار جێ دەهێڵن و دەچنە دەرەوە، بەڵام ئیبراهیم خۆی نەخۆش خست و بە دایک و باوکی گوت، کە ئەو ناتوانێ دەرچێت، لە دۆشەک و لێفەی نەخۆشیدا دەمێنێتەوە، هەموو خەڵکی شار پێویستی و خواردنیان پێچایەوەو ڕۆشتن، لە کش و ماتی و

چۆڵ و هۆڵی شاردا، لە نیوەڕۆدا، تەورێک دەخاتە سەر شانیەوەو بە بن پاساڕو کۆڵانە تەسکەکانی شاردا، خۆی دەگەیەنێتە ناو بتخانەکە، بە تەور بەر دەبێتە هەموو بتەکان و دەیانشکێنێت، جگە گەورەکەیان.. وە تەورەکە، بە شانی بتە گەورەکەوە جێ دەهێڵێ و دەگەڕێتەوە بۆ ژێر لێفەکەی.. کە ئێوارە خەڵکی لە سەیران دەگەڕێنەوە، ئەو کارەساتە دەبینن، گومانیان هەر بۆ ئیبراهیم دەچێت، چونکە پێشتر زۆر ڕەخنەی لەم لاو لا لە بتەکان گرتبوو، دوای ئەوەی کە لەسەری ساغ دەبێتەوە، دارێکی زۆر لە دەشت و دۆڵێکدا کۆ دەکەنەوەو، ئاگرێکی گەورە دەکەنەوە، کە تین و گەرمایی تا ماوەیەکی دور دەڕواو تەنانەت باڵندەش بەو ناوەدا گوزە ناکات، ناچارن بە مەنجەنیق ئیبراهیم هەڵبدەنە ناو ئاگرەکە.. خەڵکەکە چەند شەوو ڕۆژ بەدەوری ئەو ئاگرەدا دادەنیشن، هەتا بزانن ئەو بت شکێنە چی لێ دێت..؟ دوای کوژانەوەی لەناو خۆڵەمێش و پشکۆکانەوە دێتە دەرەوە، وتووێژێکی توند لە گەڵ نەمرودا بەرپا دەکات، بۆ خەڵکەکەی دەسەلمێنێ کە تەنها خوا خاوەنی پەرستنەو بتەکان و نەمرود هیچ توانایەکی مردن و ژیانەوەیان نیە..!!

باشترین نمونەش ئەو ئاگرەیە کە هەمو شتێکی خوارد، بەڵام ئیبراهیمی بە موعجزەیەک ڕزگار کرد دوای چەند سەدەیەک و پاش وەفاتی ئیبراهیم، ئەم ڕوداوە دەماو دەم دەڕواو دەبێتە ئەفسانەو، ئاگریش بۆ سەیران و سەرەتای بەهارو جەژنی نەورۆزو سەری ساڵ زیاد کرا، ئاگریان بە پیرۆز ڕاگرت، پاش ئەویش بە چەند سەدەیەک، ڕوداوی کاوەو شۆڕش لە دژی زوحاک لە نەورۆزدا بەرپابو، (یادەکە) بو بە (سێ) جەژن، یەکەم نەورۆزو سەری ساڵ و بەهار، دووەم: ئاگر کردنەوە بە بۆنەی ڕزگار بونی ئیبراهیم لە سوتانی لەو ئاگرەدا ، سێیەم: کاوەو زوحاک.. بەڕای من ئەم جەژنە ئاینیەو ئاوا هاتوەتە کایەوە، ڕۆژگار ڕاستیەکان ساغ دەکاتەوە، هەرچەندە ئیستا گیانی نەتەوایەتی کراوە بە بەریدا بەم شێوەیە، سێ جەژن لە یەک جەژندا کۆکراوەتەوە، جگە لەوەی من بۆچونێکی تر لەم ڕوداوەدا هەست پێ دەکەم.. پەیوەندی زۆر دەبینم لە نێوان ڕوداوەکانی کاوەی ئاسنگەری کوردو ئیبراهیمی کورد.. کاتی ڕوداوەکان لە یەکەوە نزیکن کە نزیکەی سێ هەزار ساڵ پێش زاین دەکات شوێنی ڕوداوەکان، نێوان دەماوەندو نینوی دەگرێتەوە کە کوردستانی گەورەیە.. ڕەنگە کاوە هەر حەزرەتی ئیبراهیم بوبێ، بەڵام تێپەڕبونی ئەو هەزاران ساڵە باسەکەی تەمو مژاوی کردوەو کردویەتیە ئەفسانە، باس و خواس و گێڕانەوەی بەر ئاگردانی شەوانی زستانی نێو ئەشکەوتەکان زیادو کەمی پێ کردوەو ڕاستیەکەی شاردەوتەوە، ئەگەر لەگەڵ

ئەفسانەکەدا بەراوردی بکەین، لە چەند ڕویەکەوە لێک چواندن دەبینین، ڕوداوی نێوان کاوەو زوحاک و ئیبراهیم و نەمرود هەر لە سنوری کوردستان بوون، ئیبراهیم (تەور)ی بەدەستەوە بوو بۆ شکاندنی بتەکان، کاوەش (چەکوش).. ئیبراهیم سەری ساڵ و بەهاری هەڵبژارد- واتە نەورۆز- بۆ شکاندنی بتەکان، کاوەی ئاسنگەریش نەورۆزو سەری ساڵی هەڵبژارد بۆ ڕاپەڕینەکەو بەرپابونی شۆڕشەکە..

نەمرودی پاشا ئەستێرەو بتی دەپەرست، زۆحاکیش هەر ئەستێرە پەرست بوو بتخانەی هەبوو. باوکی کاوە دوکانی ئاسنگەری هەبوو، باوکی ئیبراهیم دوکانی دارتاشی هەبوو بتی دروست دەکرد. نەورۆز ئاگرپەرستی ئێمە پەیوەندی بە مجوسیەوە نیە، بەڵکو نەورۆز لە مجوسی کۆنترە، نەورۆز جەژنێکی ئاینی و ڕوداوێکی گەورەی پێغەمبەرێکە، کە ئەوکاتە هەموو گەلانی ئاری یەکێ حکومەتیان بوەو جەژنەکە هەرهەموویان پێی هەڵساون. بڕوانەی نەورۆز ئەوەندە گەورە بو کە نەک ئاریەکان، بەڵکو زۆر لە گەلە سامیەکانی عیراقیش، عەرەب و بەولاتیش لە هەمان وەرزی بەهاردا جەژنیان گێڕاوە و ئێستەش لە تونس و میسر ئەو جەژنە هەر ماوە. لە ئاسەواری کلدانی و ئەغریقی و ئاشور و بابل دا باسی نەورۆز هاتیە. تەنانەت لە سەردەمی فیرعەونەکانی میسرلا بە جەژنی (شم النسیم)[42] ناوبرا. ئەگەر ئەمە جەژنێکی ئاینی نەبوبێت، ئەوانە پەیوەندیان بە جەژنی نەتەوەیی میللەتانی ترەوە چی بوە...؟ بۆیە دەبێ ئەو جەژنەی جەژنێکی ئاینی، ڕەسمی حکومەتێکی گەورە بووبێت کە هەموو جیهانی ئەوکاتەی لە ژێر دەسەلاتدا بووبێت، کە هەر لە (ذی القرنین) و پەیوەندی (ماد) دەچێت...؟!

یەکێکی تر لە پاشاکانی وڵاتی کوردان ناوی (هۆشەنگ) بوە، مێژوەکەی زۆر کۆنە، پێدەچێ لە زەمانی پێش حەزرەتی ئیبراهیم ژیابێ، بەدادپەروەر ناوبانگی دەرکردوە، کە دەسەڵاتی هەتا وڵاتی هیند چوە و دەوڵەتی پتەو بەست بوە، وتارێکی بۆ مەردم خوێندوەتەوە دەڵێ: (دوای سوپاس و ستایشی خوای گەورە... من ئەو کەسەم کە بوومە جێ نشینی گیومرثی باپیرەم، کە پاشای سەر زەوی بوو، منیش دەبم بە ڕەحمەت و بەخشش بۆ چاکەکاران و نارەحەتی و زەحمەت بۆ خراپەکاران. ئادەمیزاد بێ یان نەهێتان. من دەتوانم ئیبلیس و سوپاکەی تێک بشکێنم، تەنیام لەگەڵ خەڵکیدا تێکەڵ ببن، پەیمانم لێ وەرگرتون کە نەوەکانی ئادەمیزاد ئازار نەدەن، ڕەگ و ڕیشەی عیفریتەکانم دەرهێناوە، زۆربەیان بەرەو چیا و دۆڵ و شوێنە دورەکان رایان کردوە، هەر کامێکە ویستبیان لە نەوەکانی ئادەمیزاد نزیک بکەونەوە دەمرن...)[43] لە (دبستان المذاهب) یا دەڵێ (ئاینی هۆشەنگ زۆر پێش ئاینی زەردەشت بوە.)[44]

**(ژیاننامەی زەردەشت):**

وشەی (زەردەشت) لە گاتەکانی ئاڤێستادا کە خۆی خۆی دەناسێنێ (زەرە توشترە) هاتوە، لە تەفسیری پتر لە دو هەزار ساڵی رابردوو تا ئێستا نووسەران بیری لێ دەکەنەوە، (نیکسون) ی یونانی دەڵێ ماناکەی (ئەستێرە پەرست)ە... ناوەکە لە دوو کەرت پێکهاتوە: زەرەتە، ئوشترە، (زەرەمتە) لای (مۆلەری) ئەلمانی بەماناکەی (ئازا) دێت، یەعنی (وشتری ئازا) بەڵام (کلمل) دەڵێ بەمانای (کێوری ئەستێرە) دێت، (دوەارلە)ی بەلجیکی دەڵێ (زەرەتە) واتە (زەرد) واتە (وشتری زەرد) بەڵام لە ڕاستیدا هەرئەوە ڕاستە کە مانای (خاوەنی وشتری زەرد)[45] دەردەچێت، پێشتر باسمان کرد کە (زەردەشت) زۆر بون، بەڵام دوا زەردەشت کە کتێبی ئاوێستای بۆ هاتوەو زیاتر لە (ده) مێژونوس

وەک مسعودی حمزة الاصفهانی و یاقوت و قزوینی و .. لەسەریان نوسیوەو ناساندویانە لەسەردەمی پاشا (گوشتاسپ) لە (ورمێ) لە دایک بوە، باوکی ناوی ( پۆر شەسپ ) بوە، دایکی ناوی (دەغدۆفا) یە، ( میستەر جاکسن) کە شارەزای ئاینی زەردەشتە دەڵێ (لە نیوەی دوەمی سەدەی حەوتەم پێش زاین هاتوەتە دنیاوەو لە نیوەی یەکەمی سەدەی شەشەم دا مردوە.. زەردەشت کوڕی پورشسپ کوڕی پێترسپ لە ناوچەی ورمێ ( ڕەزائیە ) هاتوەتە دنیا..خەڵکی ئەو ناوە بە ئاگر پەرست و سیحرو جادو گەری و خۆرو مانگ پەرستنەوەخەریک بوون، ئەم کوڕە هەر لە منالیەوە شتی سەر سوڕهێنەری لێ ڕوو دەدات، کە زۆر لە کەرامات دەچێت، خەوی پاک دەبینێ و دێتە دی، لەسەر ئەوە جادوگەرەکان دژایەتی دەکەن، چەند جارێک ویستویانە بیکوژن، بەڵام بۆیان نەلواوە.. ناچار لەتەمەنی(بیست) ساڵیدا ئاوەدانی جێدەهێڵێ و دەکشێتە جێ یەکی تەنها و بەخەڵوەت و دەروون پاک کردنەوە خەریک دەبێت، لەبونەوەر و خەڵک و دەوروبەر ورد دەبێتەوە و ڕادەمێنێ.. لەتەمەنی (سی) ساڵیدا لەشاخ دێتە خوارەوە لەقەراغ (ئاوی ئاراس) لەناوچەی(ورمێ) دەست بەبانگەواز و ڕێ ڕۆشن کردنەوەی خەڵک دەکات بۆ لای خوا.. بەڵام ئەنجامی نابێ و بەرەنگاری دەکرێ.. ناچار کۆچ دەکات بۆ ناوچەی (توران) و (سکستان) و داوای لابردنی بتەکان و یەکتا پەرستی دەکات، جادووگەر و زێوانی ئەشکەوتە تاریک و بت خانەکان بەربەرەکانی دەکەن و دەری دەکەن، بوختان و قسەی ناشرینی بۆ هەڵدەبەستن، ئەمجارەش بەناچاری لەسەر داوای خوا، کۆچ دەکات بۆ ناوچەی (باختەر) لەخواروی ڕۆژئاوای شاری (مەشهەد). دووساڵ لەگەڵ (ویشتاسپ)ی پاشای وڵاتی باختەر خەریک دەبێ، هەتا دەیهێنێتە سەر ئاینەکەی، (ویشتاسپ) یان کشتاسپ ساڵی ٦٦٨ پ ز فەرمانڕەوای وڵاتی (بەلخ) بووە، (٣٨) کوڕی بووە کەیەکیان (ئەسفندیار)ە و باوکی (بەهمەن)ە، کەباباگەورەی لوڕ و بەختیاری وهەورامیە..[46] کشتاسپ کوڕی لو هراسب کوڕی ئەرجان کوڕی کەیقوبادی کوردە، لەنەژادی (کیانی)یە، کەیەکەم فەرمان ڕەوای زنجیرەی کیانی‌یە.. (زەردەشت) (بەرجیسپ)ی کچی (جاماسپ)ی وەزیری کشتاسپ مارە کرد، وەکچی برایەتی خۆی کەناوی (ئاهو) بوو، دابە جاماسپ.. جاماسپ باوکی پیرشالیاری یەکەمە، کەهاوناوی ئەم وەزیرەیە، وە کوڕەزازایەتی.. بەم جۆرە جاماسپ زاوای زەردەشت و، وەزیری ئەو حکومەتە، زۆر یاریدەی ئەم ئاینە نوێیە دەداو ڕێگای بۆ هاساز دەکات، ئاینەکە بناغە دادەکوتێ و بلاودەبێتەوە.. کوڕی وەزیرەکان لەدەوری زەردەشت کۆدەبنەوە و دەبنە یاریدەدەرێکی باش، دەوڵەتی میدیا لەسەر بناغەی ئەم ئاینە دامەزرا، ئاوێستا کرایە ئاینی ڕەسمی.. (ژان وان) دەڵێ زەردەشت هەمیشە لەنەبەردی خوێنین دابوو دژ بە بۆچوونی مەجوس و ساحیر و جادووگەرەکان..)[47] ئەو کاتەی کە ویستاسپ هاتە سەر ئاینی نوێ زەردەشت داری (سەرو)ە بەناوبانگەکەی ناشت، ئەم دارە هەتا ساڵی ٨٦١ پاش زاین هەرما و وەک بتێک بویە جێ نزرگەیەک و جێ دەستی ئەو پیاوە مەزنەو پیرۆز ڕاگیرا.. بەڵام لەو ساڵەدا خەلیفەی

عەباسی (المتوكل) داوای كرد بڕیان و ساقەكەیان هێناو لەدروست كردنی سەرای (سامەڕا)دا بەكاریان هێنا.. (پلین)ی فەیلەسوف دەڵێ (زەردەشت تاكە مرۆڤێكە كەكاتی لەدایك بونی دەم بەخەندە بوە، كەهەموو كەسی تر دەم بەگریان بوون، نیشانەی ئەوەیە كەدەكەوێتە بەر میهرەبانی و پاڵپشتی خواوەند.. لە مروجدا دەڵێ (زەردەشت (٣٥) ساڵ پێغەمبەرایەتی كردوە)[48] زەردەشت لەتەمەنی (٧٧) ساڵیدا لە جەنگێكی كەبۆ بلاوكردنەوەی ئاینەكەی خەریك بوو، لەگەڵ میللەتی (هیون)دا لەپێناوی خوا و ئاینەكەیدا كوژرا.. مێژوو نوسان لەسەر ئەوەن كە ئە فلاطون و فیساگورس لەگەورەترین شاگردانی قوتابخانەی زەردەشت بوون..

مسعودی دەڵێ كە زەردەشت كوژرا (خاناس) بوە جێگری كە خەڵكی ئازربایجان بووە.[49] (تۆمابۆ) دەڵێ (ئامۆژگاریەكانی زەردەشت لەگاتاو ئاڤێستادا نوسراوەتەوە، ئەمانە چەند نووسینێكی شیعری گۆرانین و بیروباوەڕی چاكە بلاو دەكەنەوە..) هەروەها دەڵێ (لەئاینی زەردەشت دا هەموو كەس بۆی هەیە كەڕوناكی یاخود تاریكی هەڵبژێرێت)[50]

احمد شناوی دەڵێ (جولەكەكان لەكاتی بەدیل گرتنیان لە بابل، ئەو كاتە سێ ساڵ مابوو بۆ مردنی زەردەشت، لەو كاتی دیلیەدا جولەكەكان لە زەردەشتەوە فێری ڕاستی و حەقیقەتی بەهەشت و جەهەنەم و شەیتان و دێو و درنج بوون)[51]

**كتێبی ئاوێستا (ئاڤێستا):**

مسعود محمد دەڵێ (بۆ یەكالآ كردنەوەی وشەی-ئاوێستا-باشترین سەرچاوە كەدیبێتم كتێبەكەی-دكتۆر محمد معینە- كەلە ئاوێستا و زەند دەدوێ، (گلدنر) دەڵێ (ئاوێستا) مانای(ئەساس و بنیان و متن) دەبەخشێت، بەلآم (ویسباخ) و (بارتۆمۆلا) دەیبەنە سەر (پەناو كۆمەك) زانای ئەرمەنی بە (اعتماد) و (ویكاندیر) بە(پەنا)ی لێك دەدەنەوە، (دالا) بەمانای (زانین) ی لێك داوەتەوە، هەندێ تر بەمانای (ڕاوەستان) یان (قانون) یان مانا كردوە.

بەلآم مانای (زەند) یان بە (شەرح) یان (زانین) داناوە كەخۆیشی لەئەسلا شەرحی ئاوێستایە.. وە (بازند) بەواتای (هۆش) لێكدراوەتەوە.. پێش بڕەوی زمانی (پەهلەوی) - كوردی كۆن - لەزۆر كۆنەوە تەفسیرێكی تر بە زمانی ئاوێستا نووسرا بوو، بەلآم ئەمە لەگەڵ (نە صي) ئاوێستا تێكەڵ بوو، هەتا ئەوەی ئاوێستا خوێنان شەرحەكەیان بەدەقی ئاوێستا زانی، ئائەم شەرحە زۆر لەدەقە هۆنراوەكانی ئاوێستای شێواندوە..)[52] هەرچی لەسەر ئاوێستا نووسراوە وتراوە، بەشێكی كەمە لەواقعی باسەكە.. (مسعودی) دەڵێ (ئەبستا) واتە (ئاوێستا)، وە بەعەرەبی پێی دەڵێن (ئەبستاق)..

ژمارەی سورەتەكانی(٢١) دانەیە، هەر سوورەتەی (٢٠٠) لاپەڕەیە، لە (١٢) هەزار پێستی گادا بەئاوی ئاڵتون و هەڵكەندراوی نوسراوەتەوە.. بەزمانێك كە تەنها زەردەشت خۆی لێی تێ دەگاو بۆ پەیڕەوانی هەیە كە تەنها لەبەری بكەن.. هەتا دەستكاری نەكرێت.. كەژمارەی پیتەكانی و دەنگەكان

(٦٠)دانەیە. هەر پیت و دەنگێک وێنەی تایبەتی خۆی هەیە، ئەو زوبانەشی ناوناوە (نوسینی ئاینی) تەنها بۆ لەبەر کردن بوو، بۆ خێر و پیرۆزی دەخوێنرێتەوە، زەردەشت شەرحێکی بۆ ئاوێستا نووسی ناوی نا (زەند) کەشەرحی فەرمایشتەکانی خوایە بۆ زەردەشتی ناردبوو، پاشان ئەمەی کردە کوردی کۆن (پەهلەوی)، دووبارە ئەمیشی وەرگێڕا بۆ فارسی و ناوی نا (بازەند)، دوای زەردەشت زاناکانی ئەو ئاینە شەرحێکی درێژیان بۆ (بازەند) نووسی ناویان نا (باردە) یان (ئەکردە)[53] ئاڤێستا پێنج بەشە ١- یستا (گاتاکان کۆنترین بەشی ئاوێستایە)٢-ویسپرد ٣-وندیدات (ڤەندیدات) واتە قانونی دژی دێو (شەیتان) ٤- یشتها ٥-خردەئەویستا[54]، سورەتەکانی ئاوێستا وەکو - سورەتی (ئەشتاد و (جترشت) و (بانیست) و (هادوخت).. سورەتی جترشت باسی سەرەتای دروست بوونی بونەوەر و کۆتایی دنیا دەکات.. هادۆخت ئامۆژگاری‌یە..

(ول د یۆرانت) فەیلەسوفی ئەمەریکی دەڵێ (زەردەشت کە بت پەرستی و ئاگر پەرستی مجوسیەکانی بینی، تورە بوو، هەڵشاخا پیایاندا ووتی: لەبونەوەردا هیچ خوایەک نیە جگە خوای تاک و تەنها کە خوای ئاسمان و زەوی و ڕوناکی‌یە) پاشان ول د یۆرانت لەباسی ئاوێستادا لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا بەناوی (قصة الحضارة) کە ٣٢ بەرگە دەڵێ: (ئەوەی کە ماوە لە ئاوێستا بەشێکی کەمە لە کتێبێکی گەورە) مانای ئاوێستا (زانستە). پاشان دەڵێ (کشتاسپ) دوو نوسخە ئاوێستای نوسیبویەوە، یەکیان ئەسکەندەری مەقدۆنی لە شاری (بەرسۆبۆلیس) سوتاندی، ئەوی تریان یۆنانیەکان بردیان بۆ وڵاتی خۆیان، وەریان گێڕاو هەموو زانستەکانی تونانی کۆنیان لەوەوە وەرگرتووە..) پاشان دەڵی ئاویستا(٥) بەشە : ا -یزنا: کە (٤٥) بەشە.ب- وسپرد: کە (٢٤) بەشە ج-وندیداد: (٢٢) بەشە ، ئەمە فقهی زەردەشت و یاساکانی ڕەوشتن لە دژی شەیتان ..ء- یشت: ئەمە بریتیەلە (٢١) سرود کە هەمووی زکرو یادە بەشێوەی لاواندنەوەو هۆرەی بەسۆز و غەمگیناوی .هـ - خردو ئە بستاق : ئەمە سڵاوات دانە لە بۆنە تایبەتیەکاندا دەخوێندرێتەوە ..)[55] کەس ئەوەندەی مسعودی باسی زەردەشت و ئاوێستای نەکردوە.. مسعودی دەڵێ: ئاوێستا قسەی خوایە و هاتوە بۆ زەردەشت پاشان زەردەشت وەری گێڕا بۆ زمانی کوردی کۆن.. مسعودی دەڵێ: فارسەکان پێش زەردەشت ئاگر پەرست بوون..

(هرمیپ ئەزمیری) کەنووسەرێکی یۆنانیە لەسەدەی سێیەمی پێش زایندا نووسیویەتی (زەردەشت لە ئامۆژگاریەکانیدا (دوو ملیۆن) دێڕ شیعری داناوە) زۆر لە کوردەکان هەزاران بەیت لەو شیعرانەی لەبەر بووە، پەیڕەوی دەکرد.. زەردەشت دەیویست لە ڕێگەی ئەو شیعرانەوە مەبەستەکانی بگەیەنێت چونکە شیعر زۆر باش و ئاسان لەبەر دەکرێ و کەمتر لەبیر دەچێتەوە، زەردەشت خۆیشی شاعیرێکی هەست ناسکی کەم وێنە بووە، چۆنی بویستایە دەیتوانی بیهۆنێتەوە...، (برهان قانع) دەڵێ: دو لێکۆڵینەوە گەیشتە ئەو ڕایەی ئەو خەتەی کە ئاوێستای پێ نووسراوەتەوە، لە کۆتایی سەدەی شەشەمی پێش زایندا پەیدا بووە)[56] (مسعودی) دەڵێ (ئەم نوسینانەی زەردەشت خۆی دایهێناوە

پیت و دەنگی بۆ داناوە، هەتا ئەسڵەکەی نهێنی بێ و دەسکاری نەکرێت، پاشان نووسینی تری داهێنا، ناوی نا (کش بیر) واتە نووسینی گشتی هەموان، بە زمانی هەموو نەتەوەکان دەخوێنرایەوە لەبەر دەکرا، ئەم نووسینە نوێیە (١٦٠) پیت و دەنگی هەبوو کەهەر پیت و دەنگێک وێنەی خۆی هەبوو.[57]

قانعی شاعیر لە دیوانی (شاخی هەورامان)[58] دا دەڵێ

کتێبی زەردەشت کە ئاوێستایە — وەک باقی کتێب خەڵاتی خوایە
بەزوان هەورامی هاتە سەر بەشەر — یانێ های زەردەشت بوو بە پێغەمبەر
تا دەوری خۆی بوو وەک باقی دینان — بەڵام نەسخ بوو ئەویش بە قورئان
ماریفەت و پیر وتەی شالیارە — کەبە پیر شالیار لەگشت دیارە.

## پیاوە ئاینیەکان:

(پیر) وشەیەکە کەبۆ پیاوە ئاینیە زەردەشتیەکان بەکاردەهێنرێن، وشەکە لە جێی شوان یان گاوان بەکار دێت، بۆ بەخێوکردنێکی دڵسۆزانە و مشورخواردنانە هاتوە وەک (رائد) لەعەرەبیدا.. وەک پیر شالیاری زەردەشتی و پیرەمەگرون و پیرەڕەش و پیرخدر و پیرمام.. بەڵام بەهاتنی ئیسلام، ئەو ناوە گۆڕا بە مەلاو شێخ و سەید، ئێستەش لەناو سۆفی و دەروێشەکاندا (پیرانی تەریقەت)، بۆ ئوستادەکانیان بەکاردەهێنن.

## ئاوێستاو یەکتا پەرستی:

دوای لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی قوڵ (ئەنکتیل دوپرون) هاتە سەر ئەو رایەی کە زەردەشت فەیلەسوف و دانشمەندێکی لێهاتووی ئاری‌یەو خوا پەرست بووە..

(مەسعود محمد) دەڵێ (پەیڕەوانی زەردەشت بە خوا پەرست ناسراون)[59] فیردەوسی لە شانامەکەیدا دەڵێ (زەردەشت ئاگر پەرست نەبووە پەرستراوی ئەوان هەر خوای تەنیا بووە..)

(شەهاب الدین) لە (حکمة الاشراف) و مسعودی لە (مروج الذهب) و ابو ریحان البیرونی لە (اثار الباقیة) دا دەڵێن (زەردەشت لە ئە فلاطون پایە بەرز تر بووە، نەک هەر ئەمەندە بەڵکو زەردەشت پێغەمبەر بووە..)[60] دووبارە ئەبو ریحان دەڵێ (ئاینی زەردەشت جیایە لەمجوس و ئاگر پەرستی..)[61] هەروەها (ابوکلام ئازاد) یش هەر لەسەر ئەو رایەیە..

(قازی ئیبراهیم) دەڵێ پێش هاتنی زەردەشت ئاگرو خۆرو مانگ و تاریکایی دەپەرسترا، بەڵام زەردەشت بڕوای یەکتا پەرستی و خوا بەتاک زانینی هێناو وتی: خوا تاک و تەنهایە، هیچ لە وێنەی نیە، داناو توانایە، هاوبەشی نیە لە دەسەلاتدا ،هەر ئەوە تاک و یەک و پیرۆزو توندو هەق و ڕوناکی)[62] مامۆستا پارەزانی دەڵێ (زەردەشت داوای لە خەڵکەکەی کرد کە خوای تاکو تەنها بپەرستن و بت پەرستی لابردو وتی نوری خوا ئەدرەوشێتەوە لەهەموو شتێکی ڕۆشن و خاوەن بلێسەدا، وە داوای لە پەیڕەوانی کرد کە ئاگرو هەواو ئاو پیس نەکەن). (بەڵام لە دوای خۆی زانایانی ئاینەکەی هاتن وبەرنامەکەیان گۆڕی و شەریعەت و ئاینێکی جیاوازیان دانا، ئەو شتانەیان قەدەغە کرد

که ئاگر یان دەوێت ، وە دەبێ تەنها بە کشت وکاڵ و بازرگانیەوە خەریک بن، ئەوە وردە وردە سەری کێشا بۆ ئاگر پەرستی و ئاتەش گەیان دروست کرد و پەیکەریان بۆ ئاگر دانا و کەم و زیادیان لە ئاینەکەدا کرد و زۆربەی ئەسڵەکەیان لە بیر چویەوە )[63] (برستد) دەڵێ (زەردەشت لەسەر ئاینی خوای تاک و تەنها بوە، ویستویەتی ئادەمیزاد بیرکردنەوەو وتەیان یەک بێ، دەیویست زەمین بەرز بکاتەوە بۆ پاکی ئاسمان، بە خو ڕەوشت بەرزیو پاکی دەروون)[64] زەردەشت دەڵێ (خوا سەرچاوەی هەموو چاکەیەکە، شەیتان سەرچاوەی هەموو خراپە و بەدکاریەکە) ئیمامی ڕازی دەڵێ ( ئاگر بە پیرۆز زانین بەشێک بوە لە ئاینی کۆنی ئاری و ماد )[65] ئاگر ڕەمزی ڕوناکی و ڕۆشنایی بوە، لەناو بەری تاریکی بووە، هەر بۆیە قسەیان پێنەوتوەو پیسیان نەکردوە، بە گوێرەی ئاینی زەردەشت (بونەوەر لە دوو هێز و لەشکری ڕوناکی و تاریکی پێک هاتوە، سەرداری لەشکری ڕوناکی (هورمز) خوایە و سەرداری لەشکری تاریکی (ئەهریمەن) شەیتانە. خوای گەورە کاروباری جیهانی داوەتە دەست شەش ملائکە جێبەجێی بکەن، وە شەیتانیش شەش معاونی هەیە بەناوی عفریت یان دێو، ئەم دێوانە هەمیشە خەریکی چاندنی تۆوی خراپەو لادانی خەڵکن لەڕێی ڕاست..) وەدەڵێ (خوا یەکەم جار گیانی دروست کرد، پاشان جیهان و بونەوەری مادی دروست کرد لە شەش دەورەدا و مرۆڤ لەدەوری شەشەمدا دروست کرا، پاشان ئەهریمەن (شەیتان) دابەزێنرا بەسەر زەوی و دەستی بە خراپە کرد بۆ دژایەتی چاکە، بەڵام کە زەردەشت هاتە دنیاوە ئیتر شەیتان بێ هێز بوو..)[66] لەئاوێستادا دەڵێ (شەیتان شەش وەزیری هەیە-نادروستی-درۆ-تورەیی-گوناه - دێوەکان-جادوگەر) (ڤاندیدات) کە بەشێکە/(ئاوێستا) دەڵێ (هەموو شەڕ پەرستەکان لە دێو و درنج، قینیان لە دادپەروەریە، ئەوەی قینی لە دادپەروەری بێت، بیروباوەڕی یاسایی نییە، ئەوەی یاسایی نەبێ کافرە، هەموو کافرێک مستەهەق مردنە)[67] لەئاوێستادا زۆر باسی دێو و درنج دەکات، بە تایبەتی بەشی (ڤاندیدات) کە یەک بەشی تایبەتە، باسی یاسای بەربەرەکانێی (شەیتان) دەکات، هەروەها خۆ دورخستنەوە و خۆ پاراستن و خۆپاکژکردنەوە.. لەدەقی (ڤاندیدات)دا دەڵێ (خوا)یە هێزی پێەومان بدەرێ، هەتا بتوانین بەو هێزە شەیتان و درنجەکان لەناو بەرین.. بمانپارێزە بائازارمان نەدەن..)[68] مسعود محمد دەڵێ (پتر لە هەزار و سەد ساڵ ئاڤێستا سەرچاوەی ئیلهاماتی گەلە ئێرانیەکان بوو، چ لە ڕووی باوەڕ و، یان لەڕوی کاری دنیاوە..)[69] ئارەق لە ئاینی زەردەشتدا حەرام بوە وەک لە ئاوێستادا هاتوە..(زەردەشت لە خوا پاڕایەوە :- خوایە کەی سەرۆکەکانی ئەم نیشتمانە ڕێی ڕاست دەگرن و ڕێی چەوت بەردەدەن..؟ کەی هەموو کەس ئازاد دەبێت؟ کەی (ئارەق) لە ناو دەبرێت؟ ئەو خواردنەوە پیسە، خۆزگە لەڕەگ و ڕیشە هەڵکەندرایە..)[70] (احمد امین) دەڵێ (ئاینی زەردەشت-ئاو و هەواو ئاگر و گڵ-ی بە توخمی پاک لە قەڵەم داوە و نابێ پیس بکرێت) وە دەڵێ (زەردەشت دوو ئیشی برەو پێ داوە، یەکەم کشت و کاڵ، دووەم ئاژەڵ داری، لەنامەکەیدا زۆر ڕێزی جوتیاری گرتوە و هانیان دەدات بۆ ئاوەدان کردنەوەی

زەوی. . ئەم ئاینە یەکەم جار بۆ (جەمشید) هات-پاشای کورد- ئەو نەتیوانی هەڵی بگرێ، پاشان درا بە زەردەشت، ئەم تیاسەرکەوت)[71] ئاینی زەردەشت داوا لە پەیڕەوانی دەکات بە (هوخت) واتە ڕاست گوتن، (هومت) واتە دەرون پاکی، (هورشت) واتە کردار و ڕەوشت پاکی.. لای یۆنان خورەوشت جیابوو لە ئاین، بەڵام لای زەردەشت وانە بوو، یاسا و پەیڕەو بوو پێکەوە، تاک و کۆمەڵ دەبوایە بیان کردایە.. واتە (پاکی دەروون و جوانی کردەوە و ڕاستی قسە)ی کۆکردبویەوە.. لە ئاینی زەردەشتدا دەبوایە(بیروکردەوەوگوتن) یەک بگرنەوە، لای زەردەشت ڕۆح (گیان) هەر دەمێنێ و نامرێ.. ئەوەی کە نامێنێ و دەڕزێ تەنها لاشەیە.. لەدوای ژیانی ئەم دنیایە، ژیانی دوارۆژ دەست پێ دەکات، شاد ئەوەیە بەهەشتیە، پەرێشان ئەوەیەدۆزەخیە..)[72]

**کاریگەری ئاینی زەردەشت لەسەر شارستانی و ڕۆشنبیری ناوچەکە :**

ئە فلاطون باسە بەهێزەکانی زەردەشتی خوێند بویەوە و پەیڕەوەکانی بینیبو کە چەند بە توندی پابەندی زانیاریەکانی زەردەشتن، ناچار بوو لە کتێبەکەیدا بەناوی (السیباد) ئاماژە بۆ جادوگەری و دانشی و قسە سیحراویەکانی زەردەشت بکات.. بەڵام (ژان وارن) دەڵێ (سەرسوڕمان لەوەدابو زۆرجار تۆمەتی جادوو سیحربازی دەدرایە پاڵ زەردەشت، زۆرجاریش سیحر و جادویان بە ئیلهام بەخشی وتەکانی دەزانی، بەڵام زەردەشت هەموو ژیانی خۆی خستبوە مەترسیەوە بۆ لەناوبردنی سیحر و جادوو، هەمیشە لەنەبەردی خوێنیین دابوو دژ بەو بۆچونانە..) (ئەوە کاری زەردەشت بوە،کەچی فەیلەسوفێکی وەکو ئە فلاطون لێی حاڵی نابێ و بە ئافریدەی سحر و جادووی لە قەڵەم دەدەن)[73] عبدالخالق سەرسام دەڵێ (ئەگەر بەوردی (ڤاندیدات)ی ئاوێستا بخوێنینەوە و گوێ بگرینە هەقایەتی دەم ئاگردانی کوردان، ئاگردان هەروەک هی ئاینی کوردان بوە، پەیوەندییەکی لەگەڵ هەقایەت خوانی و زەردەشتدا هەیە، بە تایبەت هەقایەتی دێو و درنج، هەمان بەربەرەکانی و هەمان جیهانی خەیاڵ و ئەندێشەو ڕەمزەکان دووبارە دەبێتەوە، هەروەک چۆن دێوەکان لە ژێرخاک و تاریکایی دەژین، مرۆڤیش لەبەر ڕۆشنایی و ڕوناکی سەرزەوی دەژی.. کەواتە میللەتی کورد هەزاران ساڵ خاوەنی خەیاڵ و هزر و بیروبڕواو ئەدەبێکی ڕەسەن بوە..هیچ خەیاڵ و ئەفسانە و داستانێک نیە کە لە واقعێکەوە سەرچاوەی هەڵ نەگرتبێ-هەرئەوخەیاڵ وئەفسانەکوردیانە بوو هاتنەدی ،چەرخ وفەلەک بوویەباڵۆن و تەیارە،سیمرخ بوو بەساروخ ،جامی جەم بوو بەتەلفزیون،سیحر بوو بەکیمیا ،دێو بە داگیر کەر..)[74] (دکتور عمرمحمد الطالب)و(ابو کلام ازاد) لەسەر ئەوەن کە چیروکی میللی عیراقی زۆر کاری تێ کراوە لە لایەن ئاینە کۆنەکانی ئاری یەوە، لەبارەی بیرو بڕوای دێوو درج وعفریتەوە،ئەی ئاخۆ دەبێ چ کاریگەریەکی لەسەر ئەدەبی میللە تەزەردەشتیەکان بوو بێت)[75] بەم جۆرە ئاینی زەردەشت کاریگەریەکی تەواوی لەسەر فەلسەفەی یونان و ئەغریق و ڕۆمان بوە، کاری لە ئاینی گاور و جولەکە کردوە، پاشماوەی لە ئەدەب و چیرۆکی میللی عێراق و ناوچەکانی تر هەیە هەتا ئەمڕۆش ئاسەواری لەسەر شارستانی و زەینی خەڵکی ناوچەکە ماوە.. مسعود محمد دەڵێ:(کتێبی ئاوێستا

سەقافەتی هەموو گەلە ئێرانیەکانی لە سەقافەتی گەلانی دیکە جودا کردەوە، پەیرەوانی زەردەشت بە( مەزدەیەسنا ) واتە ( خواپەرست ) ناو دەبران ،غەیری ئەوان بە( دئویەسنا ) واتە( دێوپەرست ) ناودەبران.. هەروەهادەڵێن( ئاڤێستا بەهەرپێنج بەشەکەیەوە پێشتر ژماردمان -لێ ی دەوەشێتەوەبەکۆنترین فەرهەنگی زمانە ئێرانیەکان حیساب بکرێت، چونکە هەرچی نووسینی دیکەی ئێرانی هەبێ بە دوا ئاڤێستادا هاتوە، لەڕوی تین هێنان بۆ وژدانی پێرەوەکانی ڕەنگە لە بەرایی هەموو کتێبکەوە بێت چونکە:-١) نووسینی لەخۆی بە پێشەوە نەبوە ببێتە هاویەشی لە کاریگەری دا.٢) باوەڕی پێش خۆڕەش کردۆتەوەو یەکێکی تازەی هەڵنا. ٣) هەمو ڕویەکی ژیانی گرتەوە بە فکرو ئاین و ڕەوشت و گوزەرانەوە. هەر کتێبێکی دیکە بکەیتە جێی بەراورد کردن بەلای کەمەوە یەکێک لەو سێ لایەنانەی تێدا بزرە. ئاڤێستا هەرچەند لە ڕەوو هێرشی ئەسکەندەری مەکدۆنی بۆ سەر ڕۆژهەڵات ساڵی (٣٣٢ ی پ.ز) دوچاری نسکۆیەکی کوشندە هات، دیسانەوە لە ئاکامدا بۆوە بە تاکە سەرچاوەی باوەڕو ویژدان و گوزەران.. لە ئیمپراتۆریەتی ئێران لە (ئە شکانی و ساسانی ) هەتا فەتحی ئیسلام. (یەزد گورد ) لە ساڵی ٦٥٢ ی زاینی دا کوژرا.. بەو پێیە ئەگەر ماوەی حوکمی سلوکیەکان لە حیسابدا دەربکەین، هەر لە پێغەمبەرایەتی زەردەشتەوە ساڵی ( ٦١٨ ) پ ز هەتا (٥٠-١٠٠) ساڵیکیش دوای یەزد گورد کەدینی زەردەشتی باوی مابو، بۆ ماوەی (١١٠٠) ساڵ ئاڤێستا سەرچاوەی ئیلهاماتی گەلە ئێرانیەکان بوو، چ لە ڕوی باوەڕەوە بێت، چ لە ڕوی کاری دنیاییەوە.. سامانی وەها فراوان کە لە ئاڤێستا کەوتۆتەوە، بێگومان هۆی ساماندار بونی هەر زمانێکە بوبێتە وارسی دینی زەردەشت و ئاڤێستا، بەداخەوە زمانی کوردی ئەو وارسە نەبوو، چونکە نەک هەر دەوڵەتی نەبوو.[76] بەڵکو نووسینیشی نەبوو، وارس خاوەنی دەوڵەتی ئێران و دینی ڕەسمی دەوڵەت بوو کە فارسەکان بوون، ئەگەر دەوڵەتی ( ماد ) بۆ کورد مابایە،بەیەکەم هێزی گەورەی ئێرانی- نسکۆشی هاتبایە بەر، هەردەبۆوە بە وارسی سەر لەبەری کەلەپوورو سەقافەتی ئێران، بەڵام کۆڕشی هەخامەنشینی، بە ڕوخاندنی ماد، ناوچەی پارسی کرد بە مەرکەزی حوکم و فارسیشی گێڕا بە وارسی ئەبەدی هەموو ڕابوردووی، کە دوا ڕۆژیش چووە سەر.. لەناو خۆماندا ناو ناوە بە ڕاشکاوی دەڵێین مادەم پێغەمبەری ئاڤێستا خەڵکی مادەو کورد بووە دەبێ زمانی تەبلیغاتیشی کوردی بووبێ- وەک خوا لە قورئاندا دەفەرموێ:( وما ارسلنا من رسول، الا بلسان قومه ليبين لهم)

بەڵام زانا پێتۆڵەکانی (بە توانا ) زمانە ئێرانیەکان و ئاڤێستا ناسەکان لەسەر باوەڕێک کۆ نەبونەتەوە، بەڵام لەوەدا یەکدەگرنەوە کە زمانی ئاڤێستاو زمانی فارسی هەخاونشینی لە یەکدی جودان. بەشێک لە زاناکان دەڵێن چونکە زەردەشت لای ( گشتاسپ ) پاشای باختەر (بەڵخ ) پێغەمبەرایەتی کرد، دەبێ بە زمانی ئەو هەرێمە تەبلیغاتی کردبێ بۆ ئەوەی تێی بگەن،ئەم رایەش ڕەت دەکرێتەوە بەوەدا کە هەرگیز ناوچەی بەڵخ بە بێشکەی زەردەشت و ئاینی زەردەشتی نەناسراوە، و- بەگوێرەی ئایەتەکانی ...ووش پێغەمبەران هەر بە زوبانی گەلەکانیان کیتابیان هێناوە، وەک دیارە فارس خزمی پەهلەویە

(کوردی کۆن)، پاشان فارس بو بە وارسی پەهلەوی و ئەو لە هەموو زمانەکانی تر نزیکترە بە کوردی..
زمانی کوردی - وەک وتم - لە پاش تێک چوونی مادەوە نەخاوەنی دەوڵەت بوو، نەخاوەنی دەزگای دینی کە زمانی ئاڤێستای بەکار دەهێنا. بە هەمە حاڵ بۆ زاناکان نەلواوەبڕیار بدەن لەسەر یەک بونی زمانی کوردی و ئاڤێستا، هەر دەڵێی ئاڤێستا وەجاخ کوێرێکە لەجیاتی وەچەی خۆی ئامۆزاو خاڵۆزاو پورزای ماون. کوردی شریتی نەپچڕاوی ئاوێستایە، پێغەمبەری ئاڤێستا کوردە، دەبێ ئاڤێستا بە زمانی ئەو میللەتە دانرابێ کە لە ناویاندا پێغەمبەر بوە هەتا بتوانێ تێی بگەن.. (گاتاکان) هێندە کۆنن، نەناوی مادو نە پارسی ناهێنێ دانیشتوانی ئێران هەر بە ئاریائی ناو دەبات و تێکڕای وڵات بە سەرزەمینی (ئاریا) دەناسێنێ کورد بە داخەوە نەیتوانی دوای تێکشکانی فارسەکان دەست بەسەر ئەدەب و ڕۆشنبیری و ئاسەوارياندا بگرنەوە.. بەلام ڕەنگە لە شەڕی فارس و ڕۆمدا هەمووی فەوتابێ. پاش تێکشکانی فارس بەرامبەر موسوڵمانان دوبارە فارس سەر لەنوێ باوەشیان بە ڕۆشنبیری هەموو ئێران دا کرد.(٦٢)

## ڕوخانی شارستانی و ڕۆشنبیری کورد :

گەورەترین نەگبەتی کورد لە مێژوودا ئەوەبوو کە دەوڵەتی (ماد) ڕوخا.. نەگبەتی دووەمی گەلی کورد ڕوخانی زانست و زانیاری و ئاسەوارو ڕۆشنبیریەتی.. فارسەکان دەوڵەتی مادیان ڕوخاند، بەوە دەسەڵاتی کوردی نەما.. بەلام بە ڕای من لەوە نەگبەتی تر ئەوە بو کە ڕۆمە مەکدۆنیەکان سەقافەت و ڕۆشنبیری کوردیان سوتاند.. فارس دەسەلاتی کوردی لە ساڵی ٥٥٠ پ.ز.دا ڕوخاند، بەلام مەکدۆنیەکان سەقافەت و ئاسەواری کوردیان لە ساڵی ٣٥٦ پ.ز. دا سوتاند، کە ئیتر هیچ بۆ کورد نەمایەوە لە حوکم و دەسەلاتو شوێنەواری ڕۆشنبیری.. ئیتر لەو ڕۆژەوە کورد بە وەجاخ کوێری مایەوەو دەستەو ئەژنۆ دۆش داما.. (پلوتارک) مێژوو نووسی یۆنانی کە لە پێش زایندا ژیاوە دەڵێت (هیرۆ ستراتۆس) ئەو پیاوە یۆنانیە بوو کە لە ساڵی (٣٥٦) پ. ز دا بۆ ئەوەی ناوبانگ دەربکات، پەرستگا نایابەکەی (ئەرتیمیدی) سوتاند لە شاری (ئیڤس) لە ئاسیای بچوک (کوردستانی باکور)، ئەو پەرستگایە، بە یەکێک لە حەوت شتە سەیرەکانی جیهان دەژمێرا.. هەر لەم ڕۆژەدا بوو (ئەسکەندەری مەقدۆ.نی) لە دایک بوو کە دووبارە ئەویش گەورە بوو، بو بە پاشای یۆنان و ساڵی (٣٣٢) پ.ز هاتە سەر وڵاتی فارس و (دارای کوڕی دارای) کوشت و کتێبخانە مەزنەکەی (دیار بکر) ی کوردستانی سوتاند،کە سەدان هەزار بەرگ لە دەسنووس و ئاسەواری ڕۆشنبیری و شارستانی کوردی تیا بوو،کە پاشماوەی دەوڵەتی (میدیا) ی کورد بوو، پاش ئەو،چو بۆ (ئەکباتان) پایتەختی میدیا، ئەوەشی لەوێ هەبو سوتاندی، لەگەڵ خاکدا یەکسانی کرد.. لە دیاربکر (١٢) هەزار پێستە گا کە ئاوێستای لەسەر نووسرابوو،بەر ئەو سوتاندنە کەوت.. زۆر لە ئاسەوارەکانی کورد کە پاشا فارسەکان گواستبویانەوە بۆ پایتەختە نوێکەیان،ئەوانیش بەر شاڵاوی هێرشەکانی ئەسکەندەر کەوتن، دوای ئەوەی کە لە شەڕە بەناوبانگەکەی (گاشگامیل) کە لە کوردستاندا ڕوی داو فارسەکان زۆر بە

قورسی شکان، ئیتر ڕێگە خۆش بوو، بۆ ئەسکەندەر کە هەموو ئێران بگرێت- پەلاماری شاری ( سوزی ) داو گرتی، کە هاوینە هەواری شاکانی فارس بوو، پاشان سالی ( ۳۳۱ ) پ.ز پەلاماری ناوچەی ( پێرسید ) ی دا کە مەلبەندی کۆنی فارسەکان بوو، لەم ناوچەیەدا شاری ( پێرسەپۆل ) هەیە کە کۆشکی پاشایان و گۆرستانی باپیرانی ( دارا ) ی لێ بوو، کە بە درێژایی سەدەها سال تالانی و سامانی ولاتە داگیر کراوەکان لە لایەن فارسەکانەوە لە ژێر زەمینەکانی ئەم کۆشکە دا کۆکرابونەوە، تەنها زێڕو زیوو پارە بەردە بەنرخەکانی کۆشکی ( سوزی ) چەند هەزار تەنێك دەبوو، ئەسکەندەر ئەمانەی بە(دە) هەزار جوت ئێسترو پێنج هەزار حوشتر گواستەوە بۆ مەکدۆنیا.. ئەم تالان و کاول کاریە، پەلەیەکی ڕەش بوو بە ناو چاوی ئەسکەندەرەوە، بەلام ئەو دەیوت: تۆلەی پەرستگای ( ئەسینا ) دەکەمەوە، کە فارسەکان سوتاندیان، کۆشکە نایابەکەی ( پێرسەپۆل ) نمونەی بەرزی هونەری فارس بوو ،ئەسکندر خۆی یەکەم کەس بو کە پلیتەیەکی داگیرساوی نا بە کۆشکەکەوەو، پاشان سەربازەکانیش ئەوانی تریان سوتاند، ئەو هەمو هونەرەی کە بەرهەمی چەند سەدەیەك بو، بویە خۆلەمێش لە چەند سەعاتێکدا.. پاشان دارای ڕاونا کە بەرەو ولاتی میدیا ڕای کردبوو، ( ئەکباتان ) پایتەختی کۆنی میدیای گرت و ئەویشی تالان کرد.. ئەم شارو پایتەختە کوردیە لە بەرزاییەکەی ژوروی شار کۆشکێکی مەزن و پەرستگایەکی نایابی تیابوو، کە پڕ بو لە گەورەترین زێڕو سامانی شارانی میدیاو فارس.. بە قسەی ( هێرۆ دۆتس ) حەوت دیوار دەوری شاری دابوو کە هەر یەکەیان بە ڕەنگێك لە ئەستێرەکان ڕەنگ کرابوو، ئەسکەندەر ئەم کۆشك و پەرستگایەی تالان کرد کە نزیك شاری ( هەمەدان ) ی ئێستەیە.[78]
بەم جۆرە ئاسەوارو ئاین و پەڕاوەکانی کورد فەوتان یان سوتان یان گوازرانەوە بۆ ئەسینا پایتەختی یۆنان.. نەخوێندەواری و نەخۆشی دەرونی بالی بەسەر ناوچە کوردیەکاندا کێشا.. خەرافیات و ( ئەفسانەو ئەندێشە ) خەیالاتی زۆر تێکەل بە ئاین بوو، ئاوێستا لەبیر خەلکی چویەوە، زۆری بۆ زیاد کراو زۆریشی لێ لابرا، لە بیر چون و لەناوچون و گۆڕین، کاری خۆی کرد.. خەلکی سەری لە بت پەرستی و ئاگر پەرستی و سیحرو جادوو دەرچوو، لە گەل ئەوەشدا زۆر ڕاستی هەر مابوو، پەرستگاکان دژایەتی یەکتریان دەکردو جیاوازی بیرو ڕایان هەبوو، شەڕ لە نێوان فارس و ڕۆمدا لەگەرمەیدا بو، ئەگەر ئەو جەنگە نەکرێتە شەڕی ئاینی و تێکۆشان لە نێوان بیرو باوەڕدا لەوە دەچێ میللەتان ماندو ببن و شەڕیان پێ نەکرێت، هەر بۆیە دوای ( ٥٠٠ ) سال بەسەر سوتاندنی ئاسەوارو پەرستگاو نوسراووە کوردی یەکاندا، پاشاکانی فارس بیریان کردەوە کە ئاینێکی بەهێز بهێنرێتە کایەوە، هەتا تەزویەك بەناو میللەتدا بهێنێتەوەو تەپ و تۆزی ئەو جەنگە درێژ ماوەیان لەسەر بتەکێنرێ، دوای بیر کردنەوەو سازدانی چەندین کۆڕی زانا ئاینیەکان،بیر کرایەوە کە ئاویستاو زەردەشت، لە هەموو ئاین و بیروباوەڕەکانی تر بەهێزترو دەولەمەندترو کاریگەرترە، بۆیە بڕیاری پاشایی دەرچوو بۆ کۆکردنەوەی هەموو دەست نووسی و ئاسەوارە زەردەشتیەکان، ئەوانەشیان نوسیەوە کە خەلکی لەبەری کردبوو، لە ناخیدا پاراستبوی، بەلام ئەمە زەحمەتی زۆری بۆ دروست

کردن، (ئەردەشێری بابەکان) بڕیاری دا کەوەک چۆن (ئینجیل) سوتا بەڵام شاگردەکانی موسی کۆیان کردەوەو نوسیانەوە . (تەورات) لە سەردەمی هێرشەکەی (بەختنە سر) سووتا ، بەڵام شاگردەکانی ئەو پێغەمبەرە بەسەر پەرشتی (عەزرا) کۆیان کردەوە.. هەر بەو جۆرە ئەردەشێر ویستی ئاوێستا کۆبکاتەوە.

## کۆکردنەوەی ئاوێستا:

سوتاندنی کتێبخانەو ئاسەوارە کۆنەکانی کورد سەکتەو لێدانێکی کاریگەرو زەرەرمەندو خەسارەتێکی بێ وێنە بوو بۆ سەر سەقافەت و رۆشنبیری و شارستانی کوردو بە هیچ جۆرێک قەرەبو نابێتەوە.. دوای (٥٠٠) ساڵ بەسەر ئەو کارەساتە غەمناکەدا کە سەردەم چەرخی فارسیەو (ئەردەشێری یەکەم) پاشای ئێرانە بیری کردەوە کە کار بەم جۆرە ناگوزەرێ پێویستە ئاینێک بۆ ئیمپراتۆریەتی فارس و ساسانی پێک بهێنێ بۆ پتەو کردنی بنچینەی نەتەوەو کۆکردنەوەی گەلانی تری خولگەی فارس چونکە لەو کاتەدا جەنگی فارس و رۆم ماندوی کردبون، هەروەک ساسانیەکان لاشەی کوردیان کردبوە سپەری ئیمپراتۆریەکەیان و بە کورد رۆمیان دەکوشت، بەرەکانی پێشەوەی جەنگیان پێ تەنیبون، لێرەشەوە ئەردەشێری یەکەم ئاین و فکری کورد دەکاتە خۆراکی دڵ و دەرونی ئیمپراتۆرو لە بیری ئەوەدایە بە جیهانی کردنی جەنگەکە یەکلایی بکاتەوە، بۆ ئەو مەبەستە بڕیاری دا رێکخستنێک بکات لە نێوان دین و دەوڵەتدا، دەیویست ئاوێتەکەیان لێ پێک بهێنێ بۆ خزمەت و بەهێز کردن و بەردەوامی ئیمپراتۆرەکەی و کۆکردنەوەی زانایان و بڕوا داران لە دەوری دەوڵەتەکەی دا.. بۆ ئەو مەبەستە بانگی (مویزان مویز) ی کرد کە سەرۆکی (کاهنەکان) بو ئەو پیاوە ناوی (ماهراز) بوو، سەرپەرشتیاری کاروباری ئاینی هەموو ئیمپراتۆری لەئەستۆدابوو، راوێژکاری پاشا بوو لە کاروباری ئاینی دا، ئەو فەرمانبەرە ئاینیەکانی دا دەمەزران، هەندێ جار پاشایشی دیاری دەکرد.. هەر بۆیە ئەردەشێر بانگی کردو تەعینی کرد کە بەو کارە هەڵسێ و ئاینێکی بەهێز بۆ دەوڵەت ساز بکات.. لەو کاتەدا خیلاف زۆر بوو لەسەر ئاین.. کتێبی ئاین تەنها ئاوێستا بو، ئەویش پچر پچرو نوقسان و کەم و زیادی بۆ کرابو، وە کتێبی سەرەکی ئاینی زەردەشت بو، (مویزان) کە سەرۆکی یەکەمی (پەرستگای ئاگر) بوو بڕیاری دا هەموو ئاوێستاکان کۆبکاتەوەو بیان خاتە بەر توێژینەوەو لێکۆڵینەوەو پەرتوکێکی پاکی لێ دروست بکات، کە تەواوی کرد، ئەنجا هەموو شەرعیەتێکی رەسمی پێ درا بە داوای شاپور خرایە پەرستگای (ئازەر جنسست) لە شاری (شیر) لە هەرێمی ئازربایجان، هەرچەند زۆر بەوردی نوسرایەوە بەڵام جیاوازیەکی کەم هەر ما.. (شاپوری دووەم) داوای کرد کۆنگرەیەکی گەورە ببەسترێ بە سەرۆکایەتی (مویزان مویز ئازرباز مهر سبندان).. لە کۆرەکەدا بە زۆریەی دەنگەکان بڕیاریان لەسەر دوا دەقی (نص) ئاوێستا درا دوای خوێندنەوە.. کە بریتی بوو لە (٢١) بەش کتێب، لە کۆتاییدا (مویزان مویز ئازر باز) بۆ سەلماندنی پاکی و تەواوی دەقی ئاوێستا پاکراوەکە، خۆی تاقی

کردەوەو ناسنی تەواوەی لە کۆڵ (٣٢). بەم جۆرە ئەو ئاینە کوردیە یان کردە ئاینی ڕەسمی وڵات وناوی کوردی لەسەر شوێوزایەو ئەو ئایەتانەی باسی کورد و میدیای تیابوو دەستکاری کراو کرابە ئاینی فارس بەتایبەتی و نازی بەگشتی .. بەم جۆرە ئینسانی کورد و ئاین و بیرو باوەڕو سەقافەت و ڕۆشنبیری و ئاسەوار شارستانی کورد بوو بەموڵکی ساسانیەکان و هەموو مۆرکێکی کوردی لە سەر سڕایەوەو نەما..هەر بۆیە کورد خۆشی فەوتا لە سەر نەخشەی سیاسی و جوگرافی و کۆمەلایەتی ناوچە کە کوژایەوە هەتا هاتنی ئیسلام..ئەم ڕوو لە ئاین کردنە دڵی میللەتی خۆش کرد بەهێز لەدەوری کسری و ئیمپراتۆریەتی ساسانی کۆبونەوە.دووبارە ئاویستا و زەردەشت بونەوە ئیلهام بەخشی گەلانی ئێران بەبێ کورد بەلام ئەم جارەیان بەدەست کاری و کەم و زیاد بۆکردن و لاوازترەوە.خەلکان بەتل جەنگیان بۆ فارس دەکرد، بەلکو جەنگەکەی ئاواو حەست و خۆل و خوێناوی کرد. چونکە جەنگی ئاینی و مەزهەبی لەتوندترین جەنگەکانە و درێژە دەکێشێ. لەولاشەوە ڕومەکان ئاینی گاوریان کردە ئاینی دەولەت و برەویان بە کەنیسە دا، زێڕیان لەقەشەو ڕانا ئاینەکان گرت. ڕۆمان و ئەرمەن وشامیەکان لەدەوری خولگەی ئیمپراتۆریەتی ڕۆم کۆبوتەوە. زۆر هەولیان دا گاوری بکەن بە ئاینی کوردستان بەلام باش ئەدەگیرسا،چونکە ئەوان - هەرچۆن بێت - زەردەشتیان پەسەند کردبوو..

**مژدەکانی ئاویستا بە پێغەمبەرانی دوای زەردەشت:-**

لە ئاویستا نوسراوەکەی پێش سوتان چەندین ئایەتی تیابو کە مژدەیان دەدا بە هاتنی (عیسی ومحمد) سەلامی خوایان لێ بێت، وە زۆر بە وردی کات و شوێنی لەدایک بون وابون بە پێغەمبەریانی دیاری کردبوو، لەوەندە ورد باسی کردبوو کە پیاوە ئاینیەکان دەیان زانی کەی وله کوێ لە دایک دەبن. حەزرەتی عیسی (مەسیح) سەلامی خوای لێ بێت لەسەردەمی (هیرۆد ریس پاشا)دا لە خاکی فەلەستین لە شارۆچکەی (بیت لحم) لە دایک بوو، لەو کاتەدا ئەستێرەیەکی گەش لە ئاسماندا پەیدا بوو.. پیاوە ئاینیە زەردەشتیەکان وەفدێکیان لە زانا زەردەشتیەکان بۆ ئەو مەبەستە نارد،لە ناوچەی (ورمێ)ی کوردستانەوە ڕێگای فەلەستینیان گرتە بەر، هەوالی شوێنی لەدایک بونی (مەسیح) یان پرسی (هیرۆ دیس پاشا) لەدەنگ و باسی ئەم وەفدە کوردیەی بیست،ئەوتە مەترسیەوە زانا ئاینیە جوەکانی کۆکردەوەو پرسی و ڕای پێ کردن، بۆیان دەرکەوت کە بە گوێرەی ئایەتە پێشبینیەکانی (تەورات) پێشەوایەک لە (بیت لحم) لە دایک دەبێ، مانای وایە گۆڕەکان پێش جوەکانی فەلەستین هەستیان بە لەدایک بونی عیسی کردوە، لەوانە مەسیحی ئاینی خوایان خوازردوەو یەکە بە یەکەی ئایەتەکانیان لێکداوەتەوەو بە دوای ڕاستی ماناکانیدا گەڕاون، بۆیە (هیرۆ دیس) داوای لە زانا زەردەشتیەکان کردوە، کە ئەگەر شوێنی لەدایک بونی ئەو منداڵەیان دۆزیەوە ئاگاداری بکەن، هەتا ئامادە بێ لە بەردەمیدا سوپاسی بکات، زەردەشتیەکان شوێنی لەدایک بونی حەزرەتی

عیسایان دۆزیەوە، لەبەردەمیدا سوپاسیان کردو دیاری خۆیان پێشکەش کرد، بەلام لەبەر ئەوەی لە خەودا هەوالیان پێ گەیشت بوو ، کە ئەو پاشایە نیازی خراپە بەرامبەریان.. بۆیە نەگەڕانەوە لای (هیرۆ دیس) و لە ڕێگایەکی ترەوە بە نهێنی گەڕانەوە ولاتی (ماد) و کوردستان، چونکە هیرۆدیس نیازی کوشتنی منداڵەکەی هەبوو..)[80] ڕەنگە لە ئاوێستادا چەند بەڵگەو نیشانەیەکی دابێ لەسەر جێ و شوێن و کات، کچێک کە بەرەو ڕۆژ هەلات دەکشێ و هەلگری منداڵێکە لە سکیداو لە خەڵک خۆی دەشارێتەوە، پاشان کە منداڵەکە دەبێ، خزم و خەڵک گومانی لێ دەکەن و دەڵێن ئەم منداڵەت لە کوێ بوو؟ چۆن بێ پیاو منداڵ دەبێ؟ ئەویش دەست بۆ منداڵەکە ڕادەکێشێ و منداڵیش لە بێشکەدا وەلامیان دەداتەوە کە ئەمە ئەمری خوایەو چی بوێت دەیکات ، گەورە دەبێ‌و دەبێتە پێغەمبەر.. وەک چۆن لە قورئاندا باس کراوە، هیچ گومانی تیانیە لە ئاوێستادا نوسراوە.. کوردەکان زۆر پابەندی ناخ و ناوەرۆک بون و بەدوای ڕاستیدا گەڕاون..کە منداڵێک لەو جۆرە لەدایک ببێ‌و لە بێشکەدا قسە بکات، دیارە ئەوە معجزەیەو زوو بلاو دەبێتەوەو خەڵکی دەچن بۆ سەیری.. ڕەنگە هەر لە ژیانی حەزرەتی عیسادا چەندین سەردانی ئەو پێغەمبەرەیان کردبێ و وتو وێژ چوبێتە نێوانیانەوە.. هەربۆیە دوای هەڵکێشانی عیسا بۆ ئاسمان، کوردەکان پەیوەندی توندیان هەردەمێنێ.. ئەوەتە لە(العهد الجديد) دا هاتوە ( دوای هەڵکێشانی -عیسا- بۆ ئاسمان، ئەرکی گەیاندنی پەیامەکەی کەوتە ئەستۆی دوانزە کەس لە نزیکەکانی کە بە (حەواری) ناسراون، کە دوانزە قوتابی خۆی بوون، لە ڕۆژی (پنتیکاست) کە یەکێکە لەسێ جەژنە گەورەکەی جولەکە، لەم ڕۆژەدا هەموو پیاوانی جولەکە لە (بيت المقدس) کۆدەبونەوە و لە (ئۆرشەلیم) جەژنیان دەکرد، ئەم ڕۆژە هاوکات بوو لەگەڵ چل و نۆ هەمین ڕۆژی دوای هەڵکشانی مەسیح بۆ ئاسمان.. هەر وەک لە هەموو ساڵێکدا واباو بوە، لەم ڕۆژەدا خەڵکی هەموو شوێنەکان لە ئۆرشەلیم ئامادە ن، ژمارەیەکی زۆر لەدانیشتوانی سەرزەمینی (ماد) و پارس و عیلام و جزیرە و... لە ئۆرشەلیم کۆبونەوە و پەیامبەرەکانی مەسیح، ڕسالەتی مەسیحیان بۆ باس دەکردن، ژمارەیەک ئاینی مەسیحیان پەسەند کرد و گەڕانەوە سەر زەوی خۆیان و دانیشتوانی ولاتی خۆیان تێ دەگەیاند..)[81] (ئەم بابەتە بۆمان دەردەخات کە دانیشتوانی سەر زەمینی کورد (ماد) یەکەم گەل بوون کە بروایان بە ئاینی مەسیحی هێناوە..) (پاشان لەساڵی (٣٥)ی زاینیی دا (تۆما) کەیەکێک بوە لەدوانزە ڕەسولەکەی عیسا، لەسەر ڕێگای خۆی بۆ هیندستان سەری لەخاکی (ماد) داوەو پەیامی عیسای پێ ڕاگەیاندون.. هەروەها (ماری) کە پارترپارکی کەنیسەی ڕۆژهەلات بوو، لەساڵی (٣٥-٤٥) زاینیدا لەگەڵ چەند کەسێک مزگێنی پەیامی مەسیحیان گەیاندە شاری (اربل) واتە(هەلێر)ی ئێستاو ناوچەکانی دەوروبەری (زێی گەورە)، یەکێک لە هاوڕێکانی ناردە کوردستان و ولاتی (ماد)، بەلام لە شوێنێک بەناوی (گاوار) لە ڕۆخ دەریاچەی (ورمێ)وە کوژرا.. کوردەکان گوێڕایەڵی نامە ئاسمانیەکان بوون، پاشان (گای) و (ماری) و (ئەوا) بەردەوام نێردراون بۆ ڕێپیشاندانی کوردان..)[82] بەم جۆرە کەمێک لە کوردەکان لە هەندێ جێدا بەیارمەتی نێرراوانی عیسا کەنیسەیان کردۆتەوەو بونەتە

مەسیحی.. بەڵام لە زۆربەی جیدا کەوتەنەتە بەربەرەکانێ لەگەڵ زەردەشتیەکاندا.. دوای سوتانی ئنجیل و پاشان کۆکردنەوەی بەناتەواوی و دەسکاری کردنی بە ئارەزووی لێپرسراوان بۆ بەرژەوەندی کەنیسە و دەسەڵاتی پاشایانی ئەو کاتە، چەند قسەیەکی ناجۆر بۆ عیسا و دایکی و خوای گەورە هەڵبەسراو خرایە ناو ئینجیل، کۆمەڵێ شت حەرام کرا کە خوا حەرامی نەکردبوو، وەکۆمەڵێ شت حەلاڵ کرا کە خوا باسی حەلاڵی نەکردبوو، ئاینەکەیان شێواند زۆر کەس وازی لەو ئاینە هێناو کوردەکانیش لەو ئاینە پاشگەز بوونەوە و چونەوە سەر ئاینی زەردەشتی دێرینی خۆیان و کەنیسەکانیان ڕوخاند..

## ئاوێستا مژدە بەهاتنی محمد و ئیسلام دەدات:

(عباس محمود العقاد) کە خۆی کوردە دەڵێ (ئاوێستامژدە بەهاتنی محمد دەدات) (عبدالحمید حودة السحار) دەڵێ (کورد لەسەر ئاینی زەردەشتی بوون، ئاوێستای زەردەشت زۆر بەئاشکرا وەک ئاینەکانی تر دەست نیشانی هاتنی محمد یان کردوەو سات و کات و شوێنەکەشیان دیاری کردوە..

وەلە جێ یەکدا دەڵێت: (موڵکی ساسان لەناو دەچێت بەدەست هاوڕێکانی پێغەمبەری عەرەبی.. دوای وەسیەتەکانم بکەون، گوێ ڕایەڵی بن هەتا خاوەنی ووشترە سورەکە دێت لە وڵاتی عەرەبەوە..) [83]

ئاوێستا لە زۆر جێدا مژدە بەهاتنی پێغەمبەرێکی نوێ دەدات کە بەهاتنی ئەو ئارامی و داد پەروەری بڵاوە دەکات و زوڵم و زۆر و ستەم لەسەر میللەتان دەپوکێتەوە، ئەو ئاینە دێت و ئاینەکانی تر پوچەڵ دەبنەوە وائەوە دوا پێغەمبەر و بەرنامەی خوایە بۆ سەر زەوی،تەنانەت کات و شوێنی باس کردوە و شکڵ و شێوەی دەست نیشان کردوە، هەروەک چۆن لە تەورات و انجیل دا بە ئاشکرا کات و شوێن و باسێکی وردی محمدی کردوە و تەنانەت زانای جولەکە(سەلام) بە محمدی ووت (من گومانم لەوە هەیە کە ئەوە کوڕی من نەبێت و لە یەکێکی تر بێت بەڵام گومانم لە تۆ نی‌یە کە دوا پێغەمبەری ئاخر زەمانیت..) ئەوە بوو تەنانەت (بو حیرای راهب) لەتەمەنی (١٢)ساڵی محمددا‌ازانی ئەو منداڵە پێغەمبەرە.. دیارە لە ئاوێستادا بە وردتر باسی عیسی کراوە بۆیە هەر لەکاتی لەدایک بونیدا لە بیت اللحم دەگەنە سەری و بە دیداری شاد دەبن و دواتریش لەیەکەم قۆناغی نهێنی مەککەدا دەگەنە سەر محمد و بەنوێنەری کورد بەیعەتی پێ دەدەن.. کورد هەر لە ڕوخانی دەوڵەتی (ماد) (٥٥٠)پ.ز لە تاریکی و چەوساوەییدا ژیاوە، نەخاوەنی خۆی و نەخاوەنی خاکی بووە، بەدەست ڕۆم و فارس و ئەرمەن و کلدان و ئاشورەوە چەوساوەتەوە.. بۆیە بەردەوام مژدەکانی ئاوێستایان خوێندوەتەوە و لێک داوەتەوەو، چاوەڕوان بوون کەی ئەو دوا پێغەمبەرەی سەر زەوی بێت و دادپەروەری و ئاسایش بگێڕێتەوە بۆ سەر زەوی، ئەو سەردانەشیان بۆ (بیت لحم) و سەردانی حەزرەتی عیسا هەر بۆ ئەو مەبەستە بوە، نەبا ئەو کەسە (محمد) بێت، بۆیە دوای ئەوەی بۆیان دەردەکەوێت ئەو نیە، وازی لێ دێنن و چاوەڕوانی لە دایک بوونی محمد دەکەن.. کونە پەپوی وەی شومە باڵی ڕەشی بەسەر هەموو ناوچە کوردیەکاندا کێشا بوو.. وەک لە بڵاوکراوەی پێشودا باس کرا[84] - خوا خوای ڕزگار کەرێک بون کەلەو تاریکی و بت پەرستی و کۆیلە کردنە دەریان بهێنێ..

(ئیمپراتۆریەتی ساسانی بناغەی لەسەر کۆیلەداری دامەزرابوو، گەلانی ژێر ڕکێفی خۆیان لە کورد و عەرەب و تورک لە خوێندن و زانیاری بێ بەش کردبوو، خەڵک لەژێر باج و پیتاک دا پشتیان شکابوو، کۆشکەکان پڕ بون لە کۆیلە، کۆیلە هیچ مافێکی نەبوو، لە بەرهەمی خۆی بەشی نەبوو، لەکاتی کوژرانیدا خوێنی نەبوو،) [85] دەخرانە پێش لەشکر بۆ سەر بابل و ئەرمەن و ڕۆم.. پاسەوانی سەرکردەکان و خزمەتکاری ماڵەکانیان بوون، کرابونە زێوانی بت خانەو هەڵگیرسێنەری (ئاتەش گاکان) و ئاگردانەکان، وەک فیردەوسی لەشانامەکەیدا باسی دەکات کە دەست و پێوەند و چێشت لێنەری زوحاکی خوێن ڕێژ هەموو کورد بوون،

## (پیرشالیاری زەردەشتی) :

کورد لەو سەردەمەدا عاتیفی و هەست ناسکن بە ئاسان گەرم دەبن و، سۆز دەیانگرێت، هەر یەکە هەزاران بەیت شیعری ئامۆژگاری و ئاینی زەردەشت و پیرشالیاریان لەبەر بوو، کورد سەدان (پیر)یان هەبوو، وەک (مەلا) و زانای ئیسلامی، زانیاریەکانی زەردەشتیان لە کورد دەگەیاند، یەکێک لەو زانایانە

(پیرشالیار)ی زەردەشت بوو کە(١٥٠) ساڵ پێش هاتنی ئیسلام ژیاوە، یەکێک بوە لە گەورە زاناو دانا و ناودارە پایە بەرزەکانی ناوچەی هەورامان و شارەزوور، خاوەنی ڕێبازێکی تایبەت بووە لە ئاینی زەردەشتدا،دژی ئەوانە بوەکەهەوڵیان داوە ئاگر پەرستی و بت پەرستی تێکەڵ بە ئاینی زەردەشت بکەن، کتێبێکی نووسیوە بەناوی (ماریفەتی پیرشالیار) کەگەلێ پەند و حیکمەتی تیا نوسیوەو، هەتا ئێستەش وەک پەند ئامۆژگاری و پەندی پێشینان لە ناوچەی هەوراماندا بەکاردەهێنرێ.. لە زۆر جێ‌ی ئەو کتێبەدا مژدەکانی ئاوێستای لە شێوەی هۆنراوەدا نوسیوە،مژدە بەهاتنی ئیسلام و پێغەمبەری محمد دەدات، پیرشالیار خۆی بەباخ و مەڕ و ماڵاتەوە خەریک دەکرد،

محمد بهاءالدین دەڵێ (نەوەد ونۆ پیرەی هەورامان وەک: پیرڕۆستەم و، بابابیدۆ، و پیرزەڕێن و، پیرجان و، باباحەیرانێ و، پیرداود و، پیروەتێ و، سالیار چیا..)

مامۆستا (حمە کریم هەورامی) لە گۆڤاری (پەرێستان) دا ژمارە (٤٥) باسێکی ناسک دەگێڕێتەوە و دەڵێ :

(ئەم پیرە شکۆمەندە، یەکێک بوە لە نەوەد و نۆ پیرەی هەورامان.. لەسەردەمی ئەودا پیرێکی تری وەک خۆی کە ناوی (باوە نەورۆز) بوە، ژیاوە و دۆستی یەکتری بوون، ئەم لە دیوی شاخی هەورامان دا، لە گوندی (سەرگەت) ی سەر بەشاری(خورماڵ)و، ئەویش لەشاری (هەورامان).. شاخی هەورامان، کەوتوەتە نێوانیانەوە.. وەک پیرەکان دەگێڕنەوە، ئەو خەریکی بزن بەخێو کردن بووە، ئەمیش خەریکی کشت وکاڵ.. ڕۆژێک باوە نەورۆز خەریکی پاچە کۆڵە کردنی کشت و کاڵە کەی دەبێ، لەودیوی شاخەوە، پیر شالیار ماندو نەبوونی لێ دەکات و پێی دەڵێ:

- بۆ وا خۆت ماندو دەکەی..؟

- ئەی وانەکەم چی بکەم..؟

- کشەیان لێ بکە.. باژەڵەکە دەردەچێ و پاک دەبێتەوە.. سەیرکە من شمشاڵەکەم داناوە خۆی لێ دەداو، بزنەکان ئارام دەکاتەوە..

- نا، من وەک تۆ ناکەم.. تۆ سەرت بەشتی ترەوە قاڵە.. ئەگەر کشیان لێ بکەم، دەبێ بەتاڵ دانیشم.. بەتاڵیش لەشی مرۆڤ کرمۆڵ دەکات.. من وام پێ پەسەندە؛ پیری گەورەمان شمشاڵەکەی بەدەم خۆیەوە بگرێ، تا بزنەکانی پتر ئارام بگرن..

شالیار ووتی : (ڕاست دەکەی، ئەی دیدە ڕاستەکەی ئەودیووم.. خاست فەرماوە..)

دیارە پیرشالیار ویستویەتی ڕای دۆستی خۆی (باوە نەورۆز) وەربگرێ کە ئایا مرۆڤ دانیشێ و شت بێتە بەردەمی یان ڕەنجی بۆ بدات..؟

ئەوەی شایانی وتن بێ پیری شالیار شمشاڵژەنێکی بەهرەدار بووە.)

پیرشالیاری زەردەشتی هەر لەسەر بیروباوەڕی زەردەشت پەڕاوێکی هەبوە بەناوی (ماریفەت نامەی پیرشالیاری) ئەم پەڕاوە وەک ئاوێستا بە هەورامی نووسراوە وەک قانعی شاعیر دەڵێ

ماریفەت و پیر ووتەی شالیارە کەبەپیرشالیار لەگشت دیارە (86)

پیرشالیار لە یەکێ لە پەندە مژدە بەخشەکانیدا کەلەئاوێستای وەرگرتوە دەڵێ

وەروێوە وارۆ وەروە وەرێنە وەریسە برێو چوار سەرێنە

کەرگێ سیاوە هێلە چەرمێنە گوشڵێ مەمێریۆ دوە بەرێنە

هەندێ لە پیاوە ڕیش سپیەکان دەڵێن مەبەستی پیرشالیار ئەوەیە کە ئاینێک پەیدا دەبێ وەک ئەو بەفراوەیە کەبەفر دەتوێنێتەوە، ئاینێک دێت ئەم ئاینەی ئێمە (واتە زەردەشت) بەتاڵدەکاتەوە، گوریسێک دەپچڕێ دەبێتە چوار سەر (مەبەست چوار مەزهەبەکەیە)، یان وەک چۆن مریشکی ڕەش هێلکەی سپی دەکات،

هەر کەس مرد یان بۆ بەهەشت یان بۆ دۆزەخ دەچێت..

لەجێیەکی تردا دەڵێ:

داران گیان داران جەرگ و دڵ بەرگن گاهێ پڕ بەرگن گاهێ بێ بەرگن

کەرگە جەهێلە، هێلە جەکەرگەن ڕەواس جەڕەواس وەرگ جەوەرگەن

واتە: درەختەکانیش وەک مرۆڤ گیان لەبەرن، ئەوانیش جەرگ و دڵیان هەیە، کە گەڵاو ڕیشەیانە ماوەیەک گەڵایان هەیەو ماوەیەک ئەوەرێ، مریشک لە هێلکە و هێلکە لە مریشک پەیدا دەبێ، ڕێوی لە ڕێوی و گورگ لە گورگ ئەبن، مەبەست ئەوەیە وەک چۆن درەخت پێویستی بە ڕەگ و ڕیشە هەیە هەروەها مرۆڤیش پێویستی بە خزم و یارمەتی دەر هەیە بۆ ئەوەی بەهەموویانەوە بە کۆمەڵ بژین و

ژیانێکی پڕ کامەرانی بەدەست بهێنن، مرۆڤ هەر لە مرۆڤ بوە، پێویستە پێکەوە بن، زۆرجار پیرشالیار لەپاش هەموو پەندێک لە فەرمودەکانی ئەمەی خوارەوە دووبارە دەکاتەوە:

هۆشت جەواتەی پیرشالیار بۆ گۆشت جەکیاستەی زانای سیمار بۆ

واتە: بەدڵ ئاگات لە فەرمودەکانی پیرشالیار بێت، بەڵام گوێش بگرە بۆ نێرراوی زانای پەمزگۆ.. [87]

واتە: هۆشت لە فەرمودەکانی پیرشالیار بێت و گوێشت لە نێرراوی خوا ( محمد ) بێت، کەدوای زەردەشت دێ و ئاینی ئیسلام دەهێنێ.. شیعرەکە زۆر وردە، مەبەست لەوەیە بادڵت هەر لەگەڵ خوا و ئامۆژگاریەکانی زەردەشت بێ، بەڵام گوێ قوڵاغ بە زۆر نزیکە دوا پێغەمبەر ( محمد ) بێت، هەر کەهات واز لە زەردەشت بهێنەو بچۆ سەر ئیسلام.. ئەو کاتەی پیرشالیار ژیاوە (١٥٠)ساڵی ماوە بۆ هاتنی ( محمد ) درودی خوای لەسەر بێت .. دوو پیرشالیار بوە، یەکەمیان( پیرشالیاری کوڕی جاماسب ) نوسەری ( ماریفەت )، وەپیرشالیاری دووەم کەهەر لەنەوەی ئەو بوو لەسەرەدەمی ئیسلامدا ژیاوە و شەوێ خەوێک بە پێغەمبەر ( محمد ) ەوە دەبینێ و بەیانی کە هەڵ دەسێ موسوڵمان دەبێ و ناوی خۆی دەگۆڕێ بە ( مصطفی کوڕی خودا داد ) پاشان لەسەر وتەکانی پیرشالیاری یەکەم کە دەڵێ گوێ قوڵاغی هاتنی ئیسلام بن/لە ئیسلام شارەزا دەبێ و ( ماریفەت ) دەهێنێ و لەگەڵ ئیسلامدا بەراوردی دەکات، ئەوەی کە ناگونجێ بە ئیسلام لای دەبات و ئەوەی دەگونجێ دەیهێڵێتەوە..

مێژو نوسان لەزۆر جێدا ئەم قسەیە دەگێڕنەوە ( جارێکیان کۆمەڵێک لە خەڵکی هەورامان لەناو خۆیاندا باسی رابردوی خۆیان دەکەن، یەکێکیان لە ریش سپیەکی بەساڵا چوو دەپرسێ (ئەرێ مامە قرۆنی قەدیمیا یان ماریفەت و پیرشالیاری ) واتە قورئان کۆنەیان ماریفەت.. ئەویش دەڵێ (ماریفەت و پیرشالیاری قەدیما، قرۆش هێزێکە گوشایشە کوری ئاوردانش ) واتە: ماریفەتی ئپرشالیار کۆنترە، قورئان دوێنێ (گوشایش ) هێنای،(گوشایش کوڕی پیر محمدی هەورامی )یە. یەکێکە لە نەوەد و نۆ پیرەکانی هەورامان.. [88] رەشید هەورامی دەڵێ (لەسەر قەراری پیرشالیار نابێ ( ماریفەت) بدرێ بە بێگانە.. ئینگلیزەکان زۆر هەوڵیان داوەدەستی بخەن..(مراد ئاورنگ ) خاوەنی (کردشناس ) لاپەرە( ٩٥ ) دەڵێ دانەیەک لە کتێبی ( ماریفەت )ی پیرشالیار لەلای (تیمسار) سەرلەشکری (علي قلي مظفر زەنگەنە ) هەیە، چەند هەوڵم داوە کە بمداتێ نەیداوە... بەدەست و خەت نوسراوە.. مراد ئاورنگ پێشنیاری کردوە ئەو کتێبە لەچاپ بدرێ چونکە سەرچاوەیەکی بە نرخە.. [89] (لەنامەخانەی گشتی لە تاران چەند لاپەرەیەک لە ئاوێستا تا ئێستاش ماوە..) لە ( تحفة المحتاج ) دا (مەزهەبی شافعی ) لەبەشی ژن و ژنخوازی دا نووسراوە کە دروستە بۆ پیاوی موسڵمان هاوسەری ئافرەتی موگوش ( مجوس ) بکات، چونکە خاوەنی نوسراون-اهل کتاب- قسەی ئیمام علی هێناوە کە فەرمویەتی ( اني اعلم ما علیه المجوس، عندهم شريعة يعملون بها و كتاب يؤمنون به، فعاملوهم معاملة اهل الكتاب ) وە حەزرەتی عمر هەر لەو بارەیەوە دەفەرمویت (سنوا بهم سنة اهل الكتاب.. )[90] کوردەکان کەم تازۆر پەیرەوی ئاینی زەردەشت بوون هەتا ئیسلام هات،بەڵام فارسەکان لێ یان لاداو بیروباوەری زۆریان خستە ئاینی

دەوڵەت و بەگوێرەی ئارەزوو ڕۆژگار گۆڕانکاریان تیا کردوە ئاتەشگایەکی زۆریان بۆ ئاگرپەرستن لە کوردستاندا دروست کرد کەهەتا ئەمڕۆش لە هەورامان و زۆر جێ ی کوردستاندا ئاسەواری ماوە لەدەوروبەری ناحیەی بیارە چەند جێگایەک هەیە کەئاگایان پێ ی دەڵێن (ئاتەش گا-ئایرگە).
پێش بیارە لە سەروی (باسکە درێژەوە) کە (بازی) یشی پێ دەڵێن جێیەک هەیە پێ ی دەڵێن (ئاتەشگا) کە ئێستەش شوێنەواری ماوە، لەسەر سنوری عێراق ئێران نزیک بیارە جێ ی کەش هەیە پێ ی دەڵێن (دەرەو ئالێ) گەلێ پاشماوەی خانوی گەورە گەورەی تیایە، لە دەوروبەری (پاوە) لەم ئاتەش گایانە زۆرە..
لەگەڵ ئەوەشدا پیاوانێکی زۆربون ئامۆژگاری کوردەکانیان کردوە کە لەو ئاگر پەرستیە دور بکەونەوەو دەست بە ماریفەت و ئاوێستاوە بگرن، وەتێیان دەگەیاندن کە فارس داگیر کەرەو ئاینی کوردیان شێواندوە، تەنانەت پاشاکانی فارس گوێیان بە ئاینی دەوڵەت نەدەداو هەر ڕۆژە بیرۆکەیەکیان دەچەسپاند، کە لە گەڵ هەواو ئارەزویاندا بگونجێ.. بۆ نمونە پاشای فارس (کسری قوباز) ساڵی (٤٨٨) زاینی حوکمی کردوە، کەدەبینێ وا (مزدن) زانایەکی ئەو کاتە ڕێبازێکی نوێ ی هێناوەو بیرۆکەیەکی لە چەشنی سۆشیالستی ئەمڕۆ دامەزراندوە، داوادەکات ماڵ و ژن بۆ هەموو کەس بێت و جیایەتی نەمێنێ، (قوباز) پشتی گرت و هەر خێرا کچی خوشکی خۆی کە زۆر جوان بوو مارەکرد. لەساڵی (٥٠٣) ی زاینی دا، بەڵام پیاو ماقولان لێ ی ڕاپەڕین و لایان بردو (جاماسپ) ی برایان خستە جێ ی..
کە بارودۆخ ئاوای لێ هات و جەنگ هەموو کوردستانی گرتەوەو باری سیاسی و کۆمەڵایەتی شڵەقاو فەساد دام و دەزگای هێنایە لەرزە.. ئیتر کاتی ئەوە هاتوە کە مژدەکانی زەردەشت و پیرشالیار بێتە دی و، دوا پێغەمبەری مرۆڤایەتی بێتە ژیان و ئەو فەسادانە لەسەر میللەتان هەڵگرێ.. هەر بۆیە کورد گوێ قولاغ بوون، هەر کە دەرکەوت لە قۆناغی نهێنی مەککەو دەوڵەتی مدینەدا لە سێ جێ ی جیاوازی کوردستانەوە سێ وەفد (نوێنەر) هەریەکە بە جۆرێک بەڕێ دەکەون و ڕاپۆرتە هەواڵی کوردی ستەم دیدە دەخەنە بەردەم پێغەمبەر.. کورد لە کاتێکدا هەست بە هاتنی پێغەمبەر دەکەن و وەفدی بۆ دەنێرن کە هێشتا بانگەوازەکەی لە چەند گەڕەکێکی شاری مەکە تێ نەپەڕی بوو، هەندێ خەڵکی مەککە پێیان نەزانیبوو لە قۆناغی نهێنی دا بوو.. تەواوی دەنگ و باسی ئەو سێ وەفدە کوردیە لە لە زنجیرەی داهاتودا باسی دەکەین . بە ئومێدی خوا..

سەرچاوە و پەراوێز

١-الاعلان بالتونيخ - السخاوي -ص[٧] -منهج البحث التأريخ - د.محسن محمد حسين - ص[٩]
٢- مروج النهب - المسعودي - جـ[٣] ص[١٢٥]
٣- تأريخ الرسل و الملوك - تأريخ الطبري - جـ[١] ص[٦]
٤- بدائع الزهور- محمد بن احمد بن اياى -لـ ٤٦ دار الفكر (بيروت)
٥- تأريخ الطبرى_ ابى جعفر محمد بن جرير جـ[١] ص[٨٢] الطبرى

٦- البداية والنهاية.ابن كثير _ جـ[١] لـ[١١٠]
٧- التناقض في تواريخ واحداث- محمد قاسم محمد - ص[٢٠-٣٠] جامعة قطر ١٩٩٢
٨- قصص الانبياء - دكتور عبدالوهاب النجار - قصة نوح - البداية والنهاية ص[١٣٢]
٩- البداية والنهاية- ابن كثير - ص[١٣٥]
١٠- قصص الانبياء- دكتور عبدالوهاب النجار.
١١- التناقض في تواريخ واحداث - محمد قاسم محمد - ص[١٣]
١٢- المسعودى- مروج الذهب- جـ[١] ص[٥٣] - الطبرى جـ[١] ص[١٧٩-١٩٠]
١٣- كوردستان وكورد- ئەمين زەكى- لـ[٩١] انتشارات سيديان- مهابات
١٤- رواه الترمزي- مسند امام احمد جـ[٥] ص[٨]
١٥- طبقات ابن سعد- جـ[١] ص[٤٢] -الطبري جـ[١] ص[١٠٦]
١٦- ملحمة كلكامش- طه بافر - لـ[١٨٥] الطبقة الرابعة - بغداد/تاريخ حضارة وادي الرافدين جـ[١] لـ[٢٢] احمد سوسه ١٩٨٣/٩/١٣
١٧- الاكراد في بهدينان -انور المائي - لـ[١٥] ١٩٦٠ موصل
١٨-رۆشنبیری نوێ - ژماره (١٣٢) لاپەرە (٦٤) ئەفسانەی لافاوەکە -اسماعيل رۆژ بەيانى
١٩- خلاصة التاريخ الكرد و كردستان - محمد امين زكي ط[٢] ص[٨٢] بغداد ١٩٦١
٢٠- رۆشنبیری نوێ - ژماره (١٣٥) لـ[٤١] - دەربارەی چەمکی کوردستان -د.عبد ربه سكران
٢١- تورات - سفر التكوين ٩ / ٢٨-٢٩
٢٢- مروج الذهب -مسعودي-جـ[١] ص[٥٢]
٢٣- العصر الجليدي البلاستوسين- هـ.ا.رايت - ترجمة فؤاد حمه خورشيد ص[٧٢-٨٢]
٢٤- گۆڤاری (رامان) ژماره (٨) لاپەرە (٢٣) سالّی (١٩٩٧) عبدالخالق سرسام..
٢٥-ئاوێستا- ڤاندیدات - لـ[٢٢] وەرگێڕ داود الچلبی موسل ١٩٧٢
٢٦- التناقض في تواريخ واحداث - محمد قاسم محمد- جامعة قطر ١٩٩٢.
٢٧- مێژووی کورد و کوردستان- محمد مردۆخی-لاپەرە (٨٧) مطبعة اسعد ١٩٩١
٢٨- اثبات الوصية - مسعودي - ص[١٨]
٢٩- شخصية ذي القرنين- ابو كلام ئازاد-لاپەرە (١٢٠) ١٩٦٧ وەرگێڕ ابراهيم عمر..
٣٠- مێژووی هەورامانی کۆن- لاپەرە (١١٢-١١٧)
٣١- پیرشالیاری زەردەشتی- لاپەرە/١٨
٣٢ العصور القديمة- الدكتور هنري جايمس براستد - ص[١٥٠-١٧٠] ترجمة داود قربان - المطبعة الامريكية بيروت ١٩٣٠
٣٣ رۆژنامەی (تآخي) ژماره (٩٨) ١٩٦٧/٨/٧ ابراهيم عمر

٣٤- کورد له ناو ئاین و مێژوودا- لـ[١٠٧] مطبعة راپەڕین ١٩٧٢
٣٥-محمد مردوخی- لاپەڕە (٨٧) مێژووی کورد و کوردستان..
٣٦- مێژووی کۆن- طه باقر - بەرگی دووەم
٣٧-فیردەوسی- خاوەنی کتێبی (شانامه)، شاعیری فارس بووه، ناوی (حسن کوڕی علی طوسي) يه له سالی (١٠١٠) زاینی دا ژیاوه.
٣٨- فەرهەنگی فارس- دکتور محمد معینی- بەرگی پێنجەم لاپەڕە ٤٣٣.
٣٩- الحکمة الخالدة- ابو علي احمد بن محمد مسکوية- ص[٢٧-٢٨] قاهرة ١٩٥٢
٤٠- ڕۆشنبیری نوێ- ژماره (١٠١) ١٩٨٢ د.کامیل بصیر (کوردایەتی و جەژنی نەورۆز)
٤١- البداية و النهاية- ابن کثير جـ[١-٢] ص[٢٤]
٤٢- الاساطير في بلاد ما بين النهرين- صموئيل هنري-ص[٢٤]
٤٣- غرر اخبار ملوك الفرس- ابو منصور الثعالبي ص[٥-٦]
٤٤- تأريخ الفرس الادبي جـ[١]ص[٥٤] ادور دج براون
٤٥- زاراوه سازی پێوانه- مسعود محمد-لـ[٤١٧] / مزديسنا وادب پارسی-د.محمد معین- بەشی یەکەم لـ[١٦٩-٢٢٩]
٤٦- مێژووی کورد و کوردستان- محمد مردوخی- لـ[٩٢]
٤٧- کاروان- خولی راپەڕین- وەرگێڕ لە فارسیەوە عەلی تاهیر بەرزنجی(زەردەشت لە دیدی مێژەوە).
٤٨- مروج الذهب - المسعودي -ص[٢٥٣]
٤٩- هەمان سەرچاوە -ص[٢٥٤]
٥٠- ژیانی کوردەواری - تومابۆ - حمه سعید حسن لـ[١٩٣] (١٩٨٠)
٥١- زەردەشت - احمد شناوی -لـ[٧٨] وەرگێڕ شاکر فتاح
٥٢- زاراوه سازی و پێوانه- مسعود محمد-لـ[٤٠٠]
٥٣- التنبيه و الاشراف- المسعودي-ص[١٩٥]
٥٤- مزدتساو ادب بارتس- دكتور معين-لـ[١٩٥]
٥٥- قصة الحضارة - ول ديورانت - جـ[٢] ص[٤٢٥-٤٢٩]
٥٦- گۆڤاری (بەیان) ژماره (-) لـ[٥٧] ئاوێستا لەبەر سەریخی مێژوودا.
٥٧- التنبيه و الاشراف- المسعودي- لـ[٨٠]
٥٨- شاخی هەورامان - قانع - لـ[١٢]
٥٩- زاراوەسازی پێوانه- مسعود محمد لـ[٣٦٩]
٦٠- كلمات طيبات- نووسراوي(١٤) لـ[٢٧]-المسعودي ص[١٢٦]- آثار الباقية-ص[١٠٥]

٦١- الآثار الباقية- ابوريحان البيروني- ص١٠٥ -ذي القرنين- ابو كلام آزاد ص١٣٣
٦٢- رۆژئاوای( التآخي ) ژماره ( ٨٩ ) سالی ١٩٦٧ (كورد و ئاين)
٦٣- ژیانی پێغەمبەری مەزن- عبدالعزیز پارەزانی- لـ١٢١ سالی ١٩٧٩
٦٤- كورد لە ئاین و مێژوودا- قازی ابراهیم احمد-لـ١٠٧
٦٥- التفسير الكبير- الامام الرازي-ص٣٦٩
٦٦- العقائد و الفرق الدينية- دكتور هادي-ص١٤٠ الاساس في السيرة-سعيد حوا- جـ٢
٦٧- گۆڤاری رامان- ژماره ( ٤ ) سالی ١٩٩٦ لاپەرە ( ١٦ ) عبدالخالق سرسام.
٦٨- ئاڤێستا- ئەنداز حویزی - چاپی سوەید- لـ١٠٠-١٩٠
٦٩- زاراوەسازی پێوانە-مسعود محمد-لـ٢٧١
٧٠- زەردەشت- ابو كلام ئازاد- لاپەرە ١٢٠ سالی ٢٧ ١٩٦٢- وتەی-١٠:٤٨ ئاوێستا.
٧١- فجر الاسلام- احمد امين-ص-١٠٢
٧٢- زەردەشت- ابو كلام ئازاد..
٧٣- كاروان- ژان وارن- وەرگێڕ لە فارسەوە-عەلی طاهر بەرزنجی- لـ٢١ زەردەشت لە دیدی مێژووەوە.
٧٤- گۆڤاری رامان ژماره( ٤ )
٧٥- شخصية ذت القرنين- ابو كلام آزاد- اثر البيئة في الحكاية الشعبية العراقية- د.عمر محمد الطالب.
٧٦- كوردستان لە مادەوە بۆ مدینە- حسن محمود حمه كريم ١٩٩٧
٧٧- زاراوەسازی و پێوانە- مسعود محمد ص٢٦٩-٢٧٩ - نوسەری كورد- ژماره ( ٤ ) (مزديسنا و ادب پارسی) د.محمد معین-جـ١ ص٢٣٥
٧٨- شەڕەكانی ئەسكەندەری مقدۆنی- پلوتارك- لـ١٢-٥٥ ١٩٧٣ جلال تەقی لە ڕوسیەوە وەری گێڕاوە
٧٩- الحكمة الخالدة- ابو علي احمد بن محمد مسكويه- ص٣٤ ١٩٥٢ القاهرة.
٨٠- العهد الجديد- باب الثاني- ئنجيل مه تي..
٨١- العهد الجديد-باب الثاني- لە كتێبی ( اعمال الرسل ).
(٤٣)
٨٢- گۆڤاری (كاروان)- كوردە مەسیحیەكان لەسەردەمی ساسانیدا- سركيس ئاغا جان- لاپەرە
٨٣- صلح الحديبية- عبدالحميد جودة السحار- ص١٥٢
٨٤- كوردستان لە دەولەتی مادەوە بۆ دەولەتی مەدینە
٨٥- كۆمەڵناسی كوردەواری- د.حسین خلیقی بـ١ بـ٢
٨٦- شاخی هەورامان- قانع -لاپەرە( ١٢ ).
٨٧- دبستان المذاهب- احمد ابوبكر-لاپەرە( ١٠ )
٨٨- پیرشالیاری زەردەشتی-محمد بهاءالدين صاحب- لـ٥-١٢ ١٩٦٨ مطبعة شفيق
٨٩- هەلاڵە برایمەی هەورامان-ڕەشید هەورامی- لـ٧ ١٩٧١ مطبعة ڕاپەڕین
٩٠- كورد لە ناو ئاین و مێژوودا-كازی عمر- لاپەرە( ١٢٠ )
٩١- الحكمة الخالدة- ابو علي مسكوية- ص٥ ١٩٥٢- القاهرة

# ناوەرۆک

له بلاوکراوه‌کانی کۆمه‌ڵه‌ی نووسه‌رانی ئیسلامی کوردستان

((٥٦))

له‌م ناميلكه يه‌دا :-

هه‌موو لێكۆڵه‌ره‌وان له‌سه‌ر ئه‌وه ڕێكن، كه شوێنی دابه‌زينی كه‌شتيه‌كه‌ی (نوح) دوای تۆفان - كوردستانه..

ئه‌گه‌ر هيندستان به‌دابه‌زينی (ئاده‌م) لانكی يه‌كه‌می مرۆڤايه‌تی بووبێت.. ئه‌وا كوردستان دوای نيشتنه‌وه‌ی كه‌شتيه‌كه‌و ئه‌وانه‌ی ناوی، ده‌بێته لانكی دووه‌می مرۆڤايه‌تی..!!

له‌م بيرۆكه‌يه، ئه‌وه‌مان بۆ ده‌سه‌لمێ.. ئه‌م مه‌ردمه‌ی كه ئه‌مرۆ له‌سه‌ر زه‌وی ده‌ژين، ئه‌م ميلله‌ت و گه‌ل و خێڵ و هۆزانه‌ی، به‌ڕه‌نگ و زمان و ناوی جياواز له‌سه‌ر زه‌وی بلاون..

هه‌ر هه‌موويان كوڕه‌زازای كوردن،... له خاكی كوردانه‌وه بلاوه‌يان كردوه.. هه‌موو ئه‌و مير و ميرنشين و هه‌رێم و ناوچه‌و وولاتانه‌ی كه ئه‌مرۆ ناويان هه‌يه.. له بنچينه‌دا ده‌چنه‌وه سه‌ر نه‌ته‌وه‌ی كورد.. ئه‌وه به‌دووركه‌وتنه‌وه‌يان، هه‌ريه‌كه ناوونيشانێكيان بۆ خۆيان و خاكه‌كه‌يان هه‌ڵبژاردوه،..

كه‌واته كورد باوكی مرۆڤايه‌تيه..لێره‌وه ئه‌وه‌مان بۆده‌بێته پرسيار كه ئايا نوح كورده، يان كورد له نه‌وه‌ی(نوح)ه..؟ئه‌مه ڕاستيه‌كه‌و به‌پێی زانياريه‌كانی ناو ئه‌م ناميلكه‌يه، پێويست به‌دوودڵی ناكات..!!

چاپی يه‌كه‌م